# مادده هۆشبەرەکان و بڵاوبوونەوەی له ئێران و

# رۆژهەڵاتی کوردستاندا

نووسینی: مەهدی بەدری



هەولێر 2007

**ناوی کتێب: ماددە هۆشبەرەکان و بڵاوبوونەوەی لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا**

نووسینی: مەهدی بەدری

نەخشەسازی ناوەوە: هەردی

بەرگ: ئاسۆ مامزادە

ژمارەی سپاردن: (1375)

تیراژ: (750) دانە

چاپی یەکەم 2007

نرخ: (1000) دینار

چاپخانە: چاپخانەی خانی

زنجیرەی کتێب (26)



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem @ maktoob.com
Tel: 2260311

## پێشکەشە بە:

بابی خۆشەویستم (علی بەدری) کە بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی هەشت منداڵەکەی سەرەڕای بێبەشبوون لە بینایی چاوەکانی درێغی نەکردووە، ئێمەی بە سەربڵندییەوە پێگەیاندووە.

# پێرست

# پێشەکی

ئەمە بۆ جاری دووهەمە قۆڵم هەڵماڵیوەو لەسەر مادده هۆشبەرەکان لێکۆڵینەوەم کردووە، هەروەك لە لێکۆڵینەوەی یەکەم (مادده هۆشبەرەکان و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا) ئاماژەم پێ کردوەو، مادده هۆشبەرەکان مەترسییەکی گەورەیە، هەرەشە لە کۆمەڵگەکەمان دەکات و ئەگەر پێشی پێ نەگیرێ رۆژ بە رۆژ لە پەرەسەندندایە.

بەداخەوە هەروەك پێشبینی دەکرا، ئەم بەڵا ماڵوێرانکەرە بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگای گیرۆدەی خۆی کردووە و لەو بوارەشدا هیچ چەشنە هەنگاوێك بۆ پشتگیری لەم مەسەلەیە نەکراوەو ئەگەریش کرابێ زۆر لە ئاستێکی لاواز بووە. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە خەباتێکی هەمەلایەنە دژی مادده هۆشبەرەکان لە نێو کۆمەڵگادا وەرێ خەین و خەڵکی وڵاتەکەمان لە مەترسییەکانی مادده هۆشبەرەکان ئاگادار کەینەوە. لەم سەردەمەدا دوژمنانی گەلی کورد بە تایبەتی کۆماری ئیسلامی بە پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکان رێگایان بۆ بەرەو پێشبردنی سیاسەتە دژی گەلییەکانیان خۆشکردووە. ئەو کەسانەش بۆ قازانج و بەرژەوەندی خۆیان بازرگانی بە مادده بێهۆشکەرەکان دەکەن ناراستەوخۆ لە قازانج و بەرژەوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی هەنگاویان هەڵگرتوە.

ئەم کتێبە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە و هەموو لایەنەکاتی تایبەت بە مادده هۆشبەرەکان وەك مێژوو، بەرهەمهێنان، شوێنەواری لەسەر لەش، جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان و... هتد.

## بەشی یەکەم

لەم بەشەدا بە وردی لەسەر مادده هۆشبەرەکان نووسراوە و تەواوی جۆرەکانی ئەم ماددەیە خراوەتە بەر باس شوێنەواریان لەسەر لەش و دەروون هەروەها چۆنیەتی دەربازبوون یا رزگاربوون لەم ماددەیە و هەروەها دەرمانە پزیشکییەکان کە مورفینیان تێدایە و تووشبوون دێنن، ئاماژەیان پێکراوە. گرفتی مادده هۆشبەرەکان لە وڵاتانی جیهان و مافی تووشبووان وەکو نەخۆش بە وردی

باسکراوە و ئەرکی ئێمە لە بەرامبەر تووشبووان یەکێکی دیکە لە بابەتەکانی ئەم بەشەیەو لە کۆتایشدا ئاماژە بەو ڕێکخراوانە کراوە لە پەیوەندی لەگەڵ مادده هۆشبەرەکان دامەزراون.

## بەشی دووهەم

بەشی دووهەم تایبەتە بە وڵاتی ئێران و بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لەم وڵاتەیە کە ئەم بابەتانە لە خۆدەگرێ: کورتە مێژوویەکی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، هەڵکەوتوویی جوگرافیایی ئێران، رادەی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، هۆیەکانی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان، هۆکارەکانی تووشبوون لە بواری سیاسییەوە، ڕێگاکانی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، مادده هۆشبەرەکان لە یاسای ئێراندا، ئەو دەزگایانەی کۆماری ئیسلامی بۆ پشتگیری لە بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان پێکهاتوون و کاریگەرییان.

## بەشی سێهەم

لەم بەشەدا روو دەکەینە کوردستانی ئێران (ڕۆژهەڵات) و کێشەی مادده هۆشبەرەکان و سیاسەتەکانی کوماری ئیسلامی و هۆیەکانی ئالوودەبوونی لاوان و خەڵکی کوردستان بە مادده هۆشبەرەکان و هەروەها پەیوەندی بزووتنەوە کوردییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە مادده هۆشبەرەکان دەخەینە بەر باس.

بە گشتی تەواوی بابەتەکانی ئەم کتێبە زانستییەو هەموو ئاماژەکانیش سەرچاوەکانی دەوڵەتین (تەواوی ئامارەکان لە لایەن دەوڵەتەوە ڕاگەیێندراوە) پێویستە ئەوەش بڵێم بۆ نووسینی ئەم کتێبە لێکۆڵینەوە لە دەیان لاوی تووشبوو بە مادده هۆشبەرەکان کراوە. هیوادارم هاوڵاتیانی خۆشەویست سوود لەم کتێبە وەرگرن و منیش لەو پەیوەندییەدا خزمەتێکم کردبێ، لێرەدا سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم هاوکارییان کردووم.

**نووسەر**

# بەشی یەکەم: مادده هۆشبەرەکان

## مێژووی بەرهەمهێنانی مادده هۆشبەرەکان

بەرهەمهێنانی مادده هۆشبەرەکان مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا و مرۆڤ بە مەبەستی جۆراوجۆر، بەکاریهێناوە. بەو شێوەیە، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا نووسراوە، کۆنترینیان سەرچاوەیە سۆمەرییەکانە[1] خەشخاش چوار هەزار ساڵ پێش زایین بە رووەکی بفشاریاری ناسراوە. هەروەها لە ((ئەلیاسە و ئۆدیسە))دا کە لە هەشت سەد ساڵ پێش زایین نووسراوە، هاتووە کە تریاك بە کۆنترین ماددەی هۆشبەر ناسراوە و مرۆڤ بە کاریهێناوە.

ئینسان هەر لە کۆنەوە تریاك، بەنگ و کۆکائینی ناسیوە و تا سەردەمی ئێستاش لە کاروباری پزیشکیدا، بۆ چارەسەری سکچوون، کەمکردنەوەی ئێش و ئازار و هەروەها دەرمانی بێخەوی بەکاریان هێناوە[2].

ئێرانییەکان لە سەردەمی زۆر کۆنەوە ماددەی هۆشبەریان ناسیوە و یەکەمین ماددەی هۆشبەر کە لە نێو سەرچاوەکانیاندا، باسی کراوە بەنگە. بەنگ، لە گیاناسیدا بەلاتینی cannahis Indica (کەنەفی هیندی) پێدەڵێن. ئەم ماددەیە تۆزێکە لە کوتانی پەلك و شاخە گوڵبارەکانی شادانە دروستدەکرێ[3].

لە نێو ئاڤێستا (کتێبی ئایینی زەردەشت) چەند جار باسی بەنگ کراوە. دیارە لە سەردەمی کۆن (باستان)دا، لە بەنگ بە دوو شێوە کەڵکیان وەرگرتووە: 1- بە مەبەستی کاری پزیشکی. 2- بۆ رابواردن و لە هۆشچوون. هەروەها ((هێرۆدێت)) مێژوونووسی یۆنانی سەبارەت بە ((سوکاها)) (skyths) کە لە نەژادی ئارياييەکانن لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینندا، دەنووسێ: بەکارهێنانی شادانە

لە نێو ئێرانییەکاندا باو بووە. بەکارهێنانی بەنگ و حەشیش لە ئێران لە سەردەمی سەفەوییەکاندا، پەرەیسەندووە و زۆربەی پاشاکان و دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە بەنگ و حەشیشیان بەکارهێناوە و بەو ماددەیە راهاتوون. ((شوالیە ژان باپتیست تارونیە)) جیهانگەردی فەرەنسایی لە ساڵەکانی 1632 تا 1668ی زایینی 9 جار سەردانی ئێرانی کردووە و سەبارەت بە ئێرانییەکان دەنووسێ: ئەوان (ئێرانییەکان) مەشروبێکی زۆر تاڵیان هەبوو کە بەنگیان پێدەگوت. ئەم مەشروبە لە پەلکی شادانە و ناو دەیانگرتەوە، هەر کەسێك خواردبای وەکو شێتی لێ دەهات و زۆر جوڵەی سەیر و جێگای سەرسوڕمانی لەخۆ نیشان دەدا[4]. دیارە هەندێك لە مێژوونووسان، نووسیویانە کە ئێرانییەکان بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکانیان لە ئۆزبەکەکان کەلە باکووری ئێران دەژین وەرگرتووە[5]. بەکارهێنانی حەشیش بە مەبەستی رابواردن و چوونە نێو دنیای نەشئەبوون، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ژیانی کۆن. هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن: لە بەرهەمەکانی شاعیرە ئێرانییەکان، مەسنەوی ((مەولانا جەلالەدین مەولەوی)) کۆنترین سەرچاوەیە کە باسی بەنگ و حەشیش دەکا.

بە دوای بەنگ و حەشیش، ماددە هۆشبەرێکی دیکە کە هاتووەتە ئێران تریاك یا ئەفیونە. بڵاوبوونەوەی ئەم ماددەیە بازاڕی بەنگ و حەشیشی داخست. تریاك عەرەب پێیدەڵێ: تریاق لەگەڵ ئەوەی کە لەم سەردەمەدا، تریاکی پێ دەڵێن جیاوازی هەیەو لەو سەردەمەدا، دژە ژەهرێك بووە کە پێکهاتووە لە تێکەڵاوی چەند ماددە بۆ دەرمانی مار پێوەدان و دووپشك و.. هتد[6] بەکارهاتووە.

بەکارهێنانی تریاك لە ئێراندا، مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و بە پێی هەندێك سەرچاوە بۆ 1400 ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، واتە ئەو کاتەی عەرەبەکان ئێرانیان داگیرکرد. بە پێی ئەو سەرچاوانە دۆشاوی کوکنار یا ئەفیون بۆ یەکەمجار لە رێگای سوپای عەرەب هاتووەتە ئێران[7]. بە گشتی بەکارهێنانی تریاك لە ئێراندا، هەر وەکو شوێنەکانی دیکەی جیهان بە دوو مەبەستی دەرمانی و رابواردن بەکارهاتووە.

میسرییەکانیش لە سەردەمی زۆر کۆنەوە، حەشیش یا بەنگیان ناسیوە و هەروەها هیندوراسەکانیش بەکاریانهێناوە[8]. بە پێی هەندێك سەرچاوەی دیکە لە سەدەی دوازدەیەمی زایینی فیداییەکانی فیرقەی ئیسماعیلی لە ئەوروپا بە حەشاشین ناسرابوون. بەو شێوەیە کە ئەم فیرقەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینییەکانیان حەشیشیان بەکاردەهێنا، تا بیر لە چارەنووسی کارەکانیان نەکەنەوە[9]. دواتریش ((مارکۆپۆلۆ)) لە راپۆرتێکدا باسیکردووە. ئەم فیرقەیە بە رێبەری حەسەن سەباح لە ئێراندا، سەریهەڵداوە[10].

داری کۆکا، کە کۆکائینی لێ دروستدەکرێ، بە شێوەیەکی زۆر بەربڵاو لە ئەمریکای باشوور بە تایبەتی پیرۆ، پۆلیڤیا و زنجیرە چیاکانی ((ئەندیز)) هەیە و لەبەر ناو و هەوای لەبار بۆ ئەم دارە، خەڵکی ناوچەکە هەر لە کۆنەوە ئەم دارەیان ناسیووە و گەڵای ئەم درفشارەیان بەکارهێناوە[11].

رووەکی ((قات)) یش، لە کۆنەوە ناسراوە، ((ئەسکەندەری مەقدوونی)) لە میسر بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سەربازەکانی وەك: دەرمان بە کاریهێناوە. لەسەدەی شازدەیەمدا، بەو شێوەیە کە مێژوونووسە عەرەبەکان باسیانکردووە ئەم رووەکە لە یەمەن و حەبەشەدا چێنراوە و هەر لەوێوە بۆ وڵاتانی دیکە بەرێکراوە[12].

قات هێزی سیستەمی دەمارەکان زۆر دەکا و تا ئێستا لە لایەن هیچ وڵاتێکەوە قەدەغە نەکراوە. ئەم رووەکە جیا لە قات چەند ناوێکی دیکەی هەیە کە بریتین لە: چای ئەفریقی، چای عەرەبی، کفتا، کات، میرا، مۆرا، میۆنجی، تاست، واریس و... هتد. هەروەها لە یەمەن جشن، صبری، صودی و مرامیی پێ دەڵێن[13].

## ئەو ناوچەو وڵاتانەی ماددەی هۆشبەر بەرهەمدێنن

بەپێی هەندێك بەڵگەو سەرچاوەی باوەڕپێکراو، ماددە هۆشبەرەکان لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بەرهەمدێت و پاشانیش رەوانەی وڵاتانی دیکە دەکرێ. ئەو کەسانەی لە کاری چاندن، بەرهەمهێنان و قاچاغی ماددە

هۆشبەرەکان دەستیان هەیە، پارەیەکی زۆریان دەستدەکەوێ، هەر بۆیە لەپێناو ئەو کارەدا، هەموو شتێك دەکەن.

مادده هۆشبەرەکان مەترسییەکی گەورەی سەردەمی ئێمەیە و بە شێوەیەکی زۆر مەترسیدار لە نێو گەلانی جیهاندا پەرەیسەندوە و هەرەشە لە داهاتوی مرۆڤ دەکا. بەداخەوە هەندێك لە وڵاتانی جیهانی سێهەم و هەروەها ئەو وڵاتانەی کە لە بواری ئابوورییەوە لاوازن، پیلانێکیان بۆ بەرگریکردن لەگەڵ بەرهەمهێنان و قاچاغ و تەنانەت بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان نییە و رێگایان بۆ مافیا و قاچاغچییەکانی مادده هۆشبەرەکان خۆشکردووە.

بەپێی راپۆرتی کۆمیسیۆنی کۆنترۆڵی مادده هۆشبەرەکان زیاتر لە 170 وڵات لەگەڵ دیاردەی مادده هۆشبەرەکان بەرەو روون و نیزیك بە 200 میلیۆن کەسیش بەردەوام ئەم ماددەیە بەکاردێنن و بوونەتە گەورەترین کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی وڵاتەکانیان[14].

مافیا رێکخراوێکی قاچاغ و تەواو نهێنییە، لە تەواوی وڵاتانی جیهاندا، دەستی هەیەو ناوەندی سەرەکی ئەم رێکخراوە لە ئیتالیایە. مافیا سەرپەرشتی کاری چاندن، بەرهەمهێنان، کاری کیمیایی لەسەر مەواد و بڵاوکردنەوەی ئەم مەوادده هەر لە یەکەم رۆژی تا ئەو کاتەی دەگاتە دەستی مرۆڤ بە مەبەستی بەکارهێنانی دەکا. مافیا دەستێکی باڵای هەیە لە نێو دەسەڵاتی هەندێك لە وڵاتانی دواکەوتوو و تەنانەت لە رێگای دانی بەرتیل بە بەرپرسانی دەوڵەتی و حکوومەتی رێگای قاچاغی مادده هۆشبەرەکان خۆشکردووە. زۆرجار بەرپرسانی دەوڵەتی بە تۆمەتی وەرگرتنی بەرتیل لە مافیا تاوانبارکراون. بۆ نموونە ئاماژە بە وڵاتانی ئیتالیا، کۆلۆمبیا، تورکیە، تایلەند و... هتد بکەین. مافیا لە نێو دەزگا دەوڵەتییەکانی ئەو وڵاتانەدا، دەستێکی باڵای هەیە و زۆر جار بە هەرەشەکردن لەبەرپرسانی دەوڵەتی رێگایان بۆ بەرەو پێشبردنی قاچاغ و

بڵاوکردنەوەی مـاددە هۆشـبەرەکان خۆشـکردووە و تەنانـەت هێنـدێك جـاریش دەستی داوەتـە تێـرور و پێکهێنـانی تـرس و تۆقانـدن لـە نێـو بەرێوەبـەران و هێزەکانی دەوڵەتیدا.

تەواوی ئەو ناوچە و مەڵبەندانـەی، مـاددە هۆشـبەرەکان بەرهەمـدێنن لـە ژێـر کۆنترۆڵی مافیا دایەو بۆ پاراستن و بەربەرەکانی لەگەڵ هێزی ئاسایشی دەوڵەتان، چەك و تەقەمەنی پێویست بۆ قاچاغچییەکان دابینکردووە، هەر بۆیە لە زۆربـەی وڵاتانی دواکەوتوودا، قاچاغچییەکانی سەر بـە مافیـا لـە هێـزە دەوڵەتییـەکان بەهێزتر و بە تواناترن. مافیا وڵاتی دواکەوتوو کە لە بواری ئاسایشی نێوخۆییدا، لاوازە و شەڕی نێوخۆییان هەیە یا لە بواری ئابوورییەوە لاوازن، بۆ بەرهەمهێنان و چاندنی ماددە هۆشبەرەکان هەڵدەبژێرێ و کەرەستەی پێویست بۆ ئەو مەبەستە لە نێو دانیشتووانی ناوچەکە دابین دەکا.

ئەفغانستان یەکێك لەو وڵاتانەیـە، کـە بـە شـێوەیەکی بەرچـاو خەشخاشـی لێ دەچێنرێ و لەو پەیوەندییەدا ((بێرنارد فراهی)) سەر بـە کۆمیـسیۆنی کـۆنترۆڵی ماددە هۆشبەرەکان لە ساڵی 1998 دا دەڵێ: یـەك لـە سـێی ئـەفیون و تریـاکی جیهان لە ئەفغانستان و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی تالیبان بەرهەمدێت. تەنانەت لە کابولی پایتەختی ئەو وڵاتە تاقیگەی تایبەتی بۆ پوختـەکردنی هێـرۆئین و ئـەفیون دامەزراوە و سەرانی تالیبانیش باجی یەك لەسەر دەیان لەسەر دانا بوو[15].

هەر لەو پەیوەندییەدا: ((رۆبرتسون)) هەواڵنێری تەلەفزیۆنی CNN روو لە ((وەکیـل ئەحمەد متەوەکێل)) وەزیری ئەوکاتی دەرەوەی تالیبان دەکات و ئەویش لە وەڵامـدا دەڵێ: شەڕی نێوخۆیی وڵات ژێرخان و سەرخانی ئابووری وڵاتەکەمانی تێك و پێـك داوە و ئەو سزایانەش کە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بە بۆنەی ((ئوسامە بن لادنـەوە)) بەسەرماندا سەپاندوویەتی ئەوەندەی دیکە باری ژیانی دانیـشتووانی ناوچـەی ژێـر دەسەڵاتی تالیبانی خراپکردووە. هەر بۆیە تا بەدیلێك بـۆ جووتیـاران نەدۆزرێتـەوە ناتوانین رێگە لە بەرهەمهێنانی ئەو ماددەیان لێ بگرین[16].

((رۆبرتسون)) لەو گەشتەیدا، روو لە پێدەشتەکانی قەندەهار دەکات و لەگەڵ ((محەممەد رەئوف)) جووتیارێکی لە مێژینەی ئەو وڵاتە قسە دەکا. ناوبراو، لە وەڵامی پرسیاری تایبەت بە خەشخاشدا، دەڵێ: لە گەنم و برنج مانگانە تەنیا 30 دۆلارم دەست دەکەوت. بەڵام ئێستا لە سایەی خواو سەری ئێوەوە، لەم سەنعەتە نوێیەدا مانگانە بە 10 هەزار دۆلاریش ناڵێم پارە، ساڵی پێشوو پتر لە 30 هەزار دولارم وەدەستهێناوە، جا برنجی چی و گەنمی چی![17] بە پێی سەرچاوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ساڵی 1996 ئەفغانستان 4600 تەن ماددەی هۆشبەری بەرهەمهێناوە و لە ساڵی 1998یشدا، 3200 تەنی بەرهەمهێناوە. هەروەها بە پێی سەرچاوەی باوەڕپێکراو تالیبان سەرپەرشتی 64 هەزار هێکتار زەوی کردووە کە خەشخاشی لێ چێنراوە[18]. هەرچەند تالیبان رایگەیاندووە رێگای بەرهەمهێنان و چاندنی ماددە هۆشبەرەکان نادات. بەڵام بە کردەوە هیچ چەشنە هەنگاوێکی بۆ هەڵنەگرتووە و داوای لە جووتیاران نەکردووە، لە چاندنی ئەو ماددەیە خۆ بپارێزن. بە پێی ئامارێك کە هەیە تەنیا لە ناوچەی قەندەهار دا، نزیکەی 200 هەزار کەس لە چاندنی خەشخاشدا، کاریان کردووە[19].

((محەممەد قاسم)) حیکایەتی هاتنی هیرۆیین بۆ وڵاتەکەی (ئەفغانستان) بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە: ئەم بازرگانییە لەگەڵ داگیرکردنی ئەم وڵاتە لە لایەن سۆڤیەتەوە هاتە ئەفغانستان و (CIA) لە چاندنی یەکەمجاری ئەم ماددەیە بەرپرسە[20]. ئەگەرچی ئەم قسەیە بەڵگەیەکی لەسەر نییە، بەڵام راستییەکی سیاسی و ناکامی شەڕی نێوان دوو زلهێزی ئەو سەردەمە بوو، کە رێگای لە بەکارهێنانی ئەم چەکەی نەدەگرت. ناوچەی ((رێڕەوی خەیبەر)) کە دەکەوێتە سەر سنووری دوو وڵاتی پاکستان و ئەفغانستان بەناوبانگترین شوێنی بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکانە و 70٪ی هێرۆئینی ئەورووپا دابین دەکات. (2001) بە پێی دوایین راپۆرتیش ئاستی داهاتی ئەفغانستان لە ماددە هۆشبەرەکان لە ساڵدا گەیشتوەتە 35 میلیارد دولار (دەوڵەتی تالیبان) و هەر کیلۆیەك 40 تا 80 دولاری ئەمریکییە. ئەو لە حاڵێکدایە، یەك کیلۆ گەنم بەچارەکە دولارێکە (25 سنت)ە[21].

بە دوای کارەساتی 11ی سێپتەمبەر و هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر ئەفغانستان و رزگارکردنی ئەو وڵاتە لە ژێر دەسەڵاتی تالیبان، وا چاوەڕوان دەکرا پێش بە چاندن و بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بگریت. بەڵام بە دوای پێنج ساڵ بەسەر رووخانی دەوڵەتی تالیبان و هاتنە سەرکاری دەوڵەتێکی دیمۆکراتیک نە تەنیا پشتگیری لەو بەرهەممهێنانە نەگیراوە، بەڵکو لە بەراورد لەگەڵ رابردوودا، ئەو رێژەیە زۆرتر بووە. بە پێی دوایین سەرچاوە ساڵی 2005 نزیکەی 85٪ ماددە هۆشبەری جیهان لە ئەفغانستان بەرهەمهاتووە[22].

ئەفغانستان یەکێك لەو وڵاتانەیە، کە بۆ چاندن و بەرهەمهێنانی خەشخاش کەش و هەوای لەباری هەیە و خەڵکی ناوچەکەش لەو پەیوەندییەدا، شارەزایی زۆریان هەیە. لەگەڵ ئەمانەش باری ئابووری ئەم وڵاتە زۆر لاوازەو خەڵکی هیچ چەشنە ئیش و کارێکی دیکەیان دەستناکەوێ تا ژیانی خۆیانی پێ بەرێوەبەرن، هەر بۆیە تا بەدیلێکی باش بۆ خەڵکی ناوچەکە نەدۆزرێتەوە ناتوانن لە چاندنی خەشخاش دەستهەڵگرن و لە لایەکی دیکەوە مافیاش ئەو مەجالەیان پێ نادات واز لە ماددە هۆشبەرەکان بێنن. لەوانەیە هەرئێستا هەندێك لە بەرپرسانی دەوڵەتی نوێی ئەفغانستان دەستیان لە بەرهەمهێنانی ئەم ماددەیە هەبێ و ناتوانن بڕیارێکی لەسەر بدەن کە دژی قازانج وبەرژەوەندییەکانیان بێت. یەکێکی دیکە لەناوچە بەناوبانگەکانی بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، ناوچەی سێگۆشەی ئاڵتوونییە. ئەم ناوچەیە کەوتووەتە نێوان سنووری سێ وڵاتی بێرمە، لائوس و تایلەندو یەکێك لە بەناوبانگترین ناوچەکانی بەرهەمهێنانی ئەفیون لە ئاسیایە. هەر لەسەر سنووری ئەم سێ وڵاتەدا، دوای بەرهەمهێنانی خەشخاش و گرتنی ئەفیون (تریاك) لەخەشخاش، ئەفیون دەکەن بە مۆرفینی تفتی دواتریش رەوانەی بانکۆك پایتەختی تایلەند دەکرێ و پاشانیش رەوانەی جیهانی دەرەوە دەکرێ[23]. حکومەتی تایلەندو وڵاتانی ناوچە ناتوانن سنوورێك بۆ ئەم کارە دابنێن. لەبەر

ئەوەی مافیا لەوێ دەستی زۆرە و خەلکی ناوچەکەش لە رێگایەوە پارەیەکی زۆریان دەستدەکەوێ. هەر بۆیە ناچنە ژێر باری بڕیارەکانی دەولەت و درێژە بە بەرهەمهێنانی ئەو ماددەیە دەدەن. سەرەڕای ئەمانە بەشێکی زۆر لە بەرپرسانی حکومەتی لە پێناو وەرگرتنی بەرتیل رێگا خۆشکەری چاندن و بەرهەمهێنان و قاچاغی ماددە هۆشبەرەکانن. لە ولاتانی ئەمریکای باشوور بەتایبەتی کۆلۆمبیا، پیرۆ و بۆلیڤیا بە شێوەیەکی بەرچاو داری کۆکا پەروەردە دەکرێ. بەپێ هەندێك سەرچاوە لە ناوچە ئەندیز کە کەوتووەتە نێوان پریۆ بۆلیڤیا. دەوروبەری 200 هەزار هیکتار زەوی هەیە کە داری کۆکای لێ چێنراوە. سالی 1860 بۆ یەکەمجار لە پەلکەکانی کۆکا، کۆکائین دروست کراوە[24]. لەو دەمەوە تائێستا بەرهەمهێنانی کۆکائین پەرەیسەندووە و خەلکێکی زۆر بە بەردەوامی ئەو ماددە مەترسیدارە بە کاردێنن. کۆکا لە (ئەندیز) بەرهەم دێت و پاشانیش رەوانەی کۆلۆمبیا دەکرێ، پاش دروستکردنی کۆکائین رەوانی بازارەکانی ئەمریکا دەکرێ. بە پێی هەندێك سەرچاوە خەلکی ناوچەی (ئەندیز) لەبەرهەمهێنانی کۆکا پارەیەکی زۆریان دەستناکەوێ و ئەو پارەیە لەگەل پارەی قاچاغی ئەم ماددەیە کە دەست قاچاغچییەکان دەکەوێ بەراوردناکرێ. ئەمریکا گەورەترین ولاتی بەکارهێنەری کوکائینە. بە ئاماژە بە هەندێك سەرچاوە 22 میلیون کەس کوکائینیان بەکار هێناوەو 4 میلیۆن کەسیش بە بەردەوامی بەکاری دێنن[25]. هەروەها سالی 1980 رێکخراوی تەندروستی جیهانی رایگەیاند 4 میلیون کەس لە ئەمریکای باشوور کوکائین بەکاردێنن و نیوەی خەلکی ناوچەی ئەندیزیش ئەم ماددەیە بەکاردێنن[26]. بە پێی سەرچاوەکان شێوەی قاچاغ و بەرێکردنی کۆکائین بۆ دەرەوەی ئەمریکای باشوور 40٪ی لە رێگای فڕۆکەیە و 60٪ی لە رێگای ناو و زەوییەوە بووە[27]. مافیا و قاچاغچییەکان بۆ بەرێکردنی ئەم ماددەیە لە هەموو پیلانێك کەلك وەردەگرن.

یەکێکی دیکە لە رووەکە سروشتییەکان کە دواتر ماددەی هۆشبەری لێ بەرهەمدێنن، ((کانابیس))ە. ئەم رووەکە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان بە شێوەی جۆراوجۆر دەچێنرێ و بەرهەمی دێنن و چەندین ناوی هەیە وەك: بەنگ، چەرس، گەنجە گوچ، گەرس، حەش، حەشیش، هێپ، هەرب، هەمپی هێندی، ماری جوانا، مری جین، پات، رداویل، ریفر، نیسمیش، چای ئێستێك تایلەندی و ویـد. ئەم رووەکە لە ولأتانی ئەمریکای باشوور وەك: کۆلۆمبیا، بەرازیل و پاراگوای، لە ئەمریکای باشووریش لە جامائیکا و مەکسیك، هەروەها لە هێند، پاکستان، تورکیە، لوبنان و ئێران بەرهەم دێت. لە لوبنان حەشیش (کانابیس) بە شێوەیەکی زۆر بەربلاو بەرهەمدێت و پاشانیش بۆ ولأتانی ئەورووپایی و ئەمریکا بەرێدەکرێ[28]. لە ئێرانیشدا، لە شارەکانی بۆناب، مەلێکان، مەراغە و بەشێك لە سەقز شادانە (حەشیش) بەرهەمدێنن[29]، بە شێکی لە ئێران بلأودەکرێتەوە و بەشێکی دیکەی رەوانەی ولأتانی دراوسێ و عەرەبی دەکرێ.

هەندێك لە ولأتانی جیهان بەمەبەستی کاری پزیشکی بە شێوەی ئاشکراو یاسایی رێژەیەکی دیاری کراو ماددەی هۆشبەر بەرهەمدێنن. بەلأم هەندێك جار ئەم بەرهەمهێنانە زیاترە لەو رێژەیە کە بۆیان دیاریکراوە. بۆ وێنە ساڵی 1980 بە شێوەی یاسایی 1750 تۆن ماددەی هۆشبەر بەرهەمهاتووە لە هەمان ساڵیشدا نزیکەی 2200 تۆن بە شێوەی قاچاغ و نهێنی بەرهەمهێنراوە[30].

بە پێی ئەو سەرچاوانەی بلأوبوونەتەوە، بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان رۆژ بە رۆژ لە پەرەسەندندایە و بە دەیان میلیۆن کەس لە جیهاندا تووشی ئەم ماددە مالوێرانکەرە بوون. بۆ وێنە تەنیا لە ولأتی ئەمریکا 41 تا 47 میلیۆن کەس جۆرەکانی ((کانابیس)) یان تاقیکردووەتەوە و لە نێوان 16 تا 20 میلیۆن کەسیش بە بەردەوامی بەکاریدێنن (تووش بوون)[31]. لە ئێرانیشدا، رێژەی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان لە پەرەسەندندایەو بە پێی سەرچاوە

دەوڵەتییەکان 20٪ لە خەڵکی نێران تووشبوون[32] و بە پێی سەرچاوەکانی دیکەش نزیکەی 10٪ی خەڵکی نێران گیرۆدەی ماددە هۆشبەرەکان بوون.

بەرهەمهێنان و بازرگانی بە ماددە هۆشبەرەکان، داهاتێکی زۆری هەیە و مافیا و قاچاخچییانی ئەم ماددەیە نە تەنیا رێگا خۆشکەری بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکانن بەڵکو بازاڕی فرۆش بۆ ئەم مەبەستە دەبیننەوە یا دروستیدەکەن. بۆ وێنە لە رێگای پروپاگەندە و کەسانی تایبەت بە خۆیان، سەرەتا هەرزان فرۆشتنی ئەم ماددەیە و پاشان کە لاوان گیرۆدەی بوون ئەوکات گرانی دەکەن. لەبەر ئەوەی سەرەتا بۆ فێرکردنی لاوان ئەو ماددەیە بە هەرزانی دەکەوێتە بەردەستیان و پاشان کە تووشیبوون لێ یان گران دەکەن. لێرەدایە کە تووشبووان بە هەر نرخێك بێت ئەو ماددەیە دەکڕن و بەکاریدێنن.

بەگشتی داهاتی ماددە هۆشبەرەکان هەروەك بەرهەمهێنانی روو لە پەرەسەندنایە. ساڵی 1998 داهاتی ئەم بازرگانییە 85 ملیارد دولار بووە، ساڵی 2000 گەیشتوەتە 500 ملیارد دولار و پێشبینی دەکرێ بۆ ساڵی 2015، ئەم داهاتە بگاتە 7 تریلیۆن دۆلار![33].

## ماددە هۆشبەرەکان و شوێنەواریان لەسەر مرۆڤ*

لەم سەردەمەدا، بە دەیان جۆر ماددەی هۆشبەر هەیە و هەرکامەیان شوێنەواری تایبەتی لەسەر لەش و دەروونی مرۆڤ دادەنێن. بە شێوەیەکی گشتی ماددە هۆشبەرەکان بۆ دوو دەستەی سەرەکی دابەشدەکرێن: 1- ماددە هۆشبەرە سروشتییەکان، کە لەسەر مێژووی چاندن و بەرهەمهێنانیان بە کورتی ئاماژەمان

* بۆ نووسینی ئەم بەشە لەم سەرچاوانە کەڵك وەرگیراوە: 1- موادی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا. 2- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟ 3- لێکۆڵینەوە لە دەیان لاوی تێکەڵاو بە ماددە هۆشبەرەکان. 4- دانستنیهای گپ قدیم و جدید.

پێکردن. 2- دەستەی دووهەم بەکاری کیمیایی لەسەر ماددە سروشتییەکان دروستدەکرێن، ئەم دەستە لە ماددە هۆشبەرەکان، هەم رادەیان زۆرترە و هەم بەکارهێنانیان لە ماددە سروشتییەکان مەترسیدارترە. لەم بەشەدا، ئاماژە بە تەواوی ماددە هۆشبەرە سروشتی و دەستکردەکان و شوێنەواریان لەسەر مرۆڤ دەکەین.

## چای، قاوە

چای و قاوە لاوازترین ماددەی هۆشبەرن کە مرۆڤ لە خواردنەکانی رۆژانەی خۆی بە بەردەوام، بەکاریان دێنێ و زۆر کەسیش لەگەڵ خواردنەوەیاندا راهاتووە و ئەگەر لە ژەمێکی خواردندا، نەیانخواتەوە تووشی سەر ئێشەو ناراحەتی دەبێ. بۆ وێنە چای لە نێو خەڵکانی رۆژهەڵاتی نێوەراست، بە تایبەتی کوردستاندا زۆر باوە و زۆر جاریش لە خەلکی بیستراوە ئەگەر بە دوای نانخواردن چای نەخوێنەوە شێت دەبن یا تووشی سەر ئێشە دەبن. بە راستی هۆی ئەو سەر ئێشە و ناڕەحەتییە لە چییەوە سەرچاوە دەگرێ.

گرنگترین ماددەیەك، کە لە نێو چای هەیە ((ئەزتئین و تانێن))ی پێدەڵێن. ئەم ماددەیە رۆنێکی خەستەو خواردنەوەی زۆر خراپە و مرۆڤ تووشی هەندێك ناراحەتی دەکا. بۆ ئەوەی زیانەکانی ئەم دوو ماددەیە کەمبکرێتەوە، دەبێ بۆ ماوەی 5 دەقە لە نێو ئاوی کوڵاو لەسەر سەماوەر داینێن تا دەم بکێشێ و دواتر لەگەڵ شیر تێکەڵی کەین و بیخۆینەوە. هەرچەندە چای لەسەر سەماوەر بێنێتەوە، رەنگی زۆرتر دەبێ و زیانەکانی زۆرتر دەبن. چای کەم رەنگ ماندوویەتی دەردەکا و بۆ هەندێك لە زگ چوونەکان باشە.

پەلکی چای ماددەیەکی تێدایە بەناوی ((تئین)) ئەم ماددەیە تایبەتمەندییەکانی ((کافئینی)) هەیە و جیا لەم ماددەیە ((تئوفیلین))، ((تانین))، ((ئەسید کالیك))، ((ئوکسالات رویتاس)) ی هەیە. گۆڵی چای 2٪ کافئین و تا ئەندازەیەکی زۆر

((ئاسن)) و ((مەنگەنیزی)) هەیە. ئەو کەسانەی بە بەردەوامی چای دەخۆنەوە، تووشی لێدانی خێرای دڵ، تووڕە بوون، پەرێشانی، بێخەوی، لاوازی لەش و قەبزی دەبن. کەسانێك ئەخۆشی ئەعساب، دڵ، نقوس و گورچیلە (ئوکسالات) یان هەیە نابێ چای بخۆنەوە.

چای دەمکراوە تێکەڵاوێکی باشە بۆ شوتنەوەی چاو یارمەتیدەری گەدەیە بۆ هەرسکردنی خواردنەکان. لە ئینگلیز و هند چای تێکەڵ بە شیر دەکەن و پاشان دەیخۆنەوە، بەم شێوەیە ((تئین)) و زیانەکانی نامێنن.

## قاوە

قاوە هاندەری دەمارەکانە. هەروەك چای یارمەتی بە گەدە دەکا لە هەرسکردنی خواردنەکان و بێ خەوی دێنێ. ئەگەر لەگەڵ شیر بخورێتەوە زیانەکانی کەمتر دەبن. ئەگەر لە خواردنەوەی قاوە بەردەوام بین، نە تەنیا گەدە تووشی زیان دەبێ بەڵکو تووشی بێخەوی، لەرزە، تووڕەبوون، تەنیایی (گوشەگیری) دەبن. لەبەر ئەوەی قاوە ئەسیدێك دروستدەکا بە ناوی ((ئۆریك))ە کاکاو لە چای و قاوە باشترە. ئەم ماددەیە لە بواری خۆراکییەوە 12٪ی ((کاربوهیدرات)) و 50٪ی چەوری هەیە و کەمتر دەمارەکان هان دەدات.

لەسەریەك چای و قاوە لەگەڵ ئەوەی خواردنەوەیان زەرەری هەیە (بۆلەش و دەروون) هەندێك قازانجیشیان هەیە، بەڵام ئەگەر بەراوردی زیان و قازانجەکانیان بکەن، زیانەکانی زۆرترە و نەخواردنەوەی ئەم دوو ماددەیە لە خواردنەوەی باشترە.

## جگەرە

بەکارهێنانی جگەرە وەکو شتێکی ناسایی کە مرۆڤ لەگەڵی راهاتووە، مێژوویەکی چەند سەدەیی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ دۆزینەوەی قارەی (کشوەری) ئەمریکا لە لایەن ((کریستۆف کۆلۆمبس)). لەو کاتەدا، خەڵکی سان سلڤادۆر

وەکو دیاری پەلکەکانی تووتنیان پێشکەشی کۆلۆمبس کردوو ئەویش هێنایەوە ئەورووپا و لەو دەمەوە بڵاوبووەتەوە. دیارە پێشتر بەکارهێنانی تووتن تەنیا لە رێگای جوینی پەلکەکان بووە. لە سەدەی حەڤدەیەمدا، وردە وردە ئەم رووەکە لە نێو خەڵکی لایەنگری دۆزییەوەو وەکو دەرمانی هەندێك نەخۆشی بەکاریاندەهێنا. دواتر بەکارهێنانی تووتن لە رێگای دووکەڵێشەوە (کێشان) لە شەڕەکانی «کریمە» بە هۆی تورکەکان تاقیکرایەوە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم، رادەی ئەو کەسانەی تووتنیان دەجووت یا دووکەڵی ئەو پەلکەیان دەکێشا، لە دوو وڵاتی ئەمریکا و ئینگلیز وەکو یەك بوو (بەرامبەر). بەڵام بە بەرهەم هاتنی یەکەم جگەرەی پێشکەوتوو، بەکارهێنانی تووتن لە سەرتاسەری جیهان ئاڵوگۆڕی بە سەرهات. لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی (1918) رادەی ئەو کەسانەی جگەرەیان دەکێشا زۆرتر لەو کەسانە بوو کە تووتن یان دەجووت. جگەرە لە بەراورد لە گەڵ سەبیلە (پیپ) زۆرتر لە نێو خەڵکیدا جێی کردبووە.

دروستبوونی جگەرە لە کارخانەکاندا، وردە وردە بەکارهێنانی لە نێو ژنانیشدا کردە باو.

دیارە دژایەتیکردن لەگەڵ بەکارهێنانی تووتن و جگەرە لە لایەن دەسەڵاتەکانەوە مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە. لە سەدەی حەڤدەیەم بەکارهێنانی تووتن لە ئێران و رووسیادا، حوکمی ئیعدامی هەبوو. هەروەها سوڵتان مورادی چوارەم (پاشای عوسمانی) رۆژانە تا 18 کەس تووشبووی بە جگەرەی لە سێدارە دەدا. سەردەمێك کێشانی جگەرە لە ئاڵمان لە نێو شەقامەکاندا قەدەغە کرابوو، لەسەدەی هەژدەیەمیشدا، وڵاتی سونیس (سویسرا) بۆ نەهێشتنی جگەرە باجێکی زۆری لەو کەسانە وەردەگرت کە جگەرەیان دەکێشا.

یەکێك لەو کەسانەی دژایەتییەکی زۆری توتنی کرد، ((جیمزی یەکەم)) پاشای بەریتانیا بوو. ناوبراو ساڵی 1604 یەکەمین ڕاگەیێندراوی دژی بەکارهێنانی توتن بە ناوی ((دژایەتی توند لەگەڵ توتن))ی دەرکرد. لەم ڕاگەیێندراوەدا هاتبوو کە بەکارهێنانی توتن بۆ چاو خراپە، بۆ لووت بێزاو و بۆ مێشك زیانهێنەر و بۆ سییەکان مەترسی هێنەرە. هەروەها بۆ کۆنترۆڵی توتن باجێکی زۆری لەسەر دانابوو. هەر لەکۆنەوە تا گەیشتوەتە ئەم سەردەمە دژایەتییەکی زۆر لە بەکارهێنانی توتن و کێشانی جۆرەکانی جگەرە کراوە و لەو بوارەدا، مرۆڤیان لە مەترسییەکانی ئەم دووکەڵە ئاگادار کردووەتەوە، بەو حاڵەش تا هاتووە تووشبووان بە جگەرە زۆرتر بوون و بە پێی سەرچاوەکان نزیك بە نیوەی خەڵکی جیهان جگەرە دەکێشن. جگەرە جیا لەوەی زیانی گیانی هەیە، لە بواری ئابوورییەوە زیانەکانی قەرەبوو ناکرێتەوە. بەڵام ئەو کەسەی لە نێو بازرگانی جگەرەدایە داهاتێکی زۆری دەستدەکەوێ. بە داخەوە پروپاگەندەی زۆر بۆ جگەرە و بەکارهێنانی وای کردووە بەشێکی زۆر لە لاوان ڕووی تێبکەن و پێی ڕابێن (تووشبوون).

بە پێی سەرچاوەیەك 6٪ی داهاتی دەوڵەتی ئینگلیز لە ڕێگای توتنەوە (سیگار) کە دەکاتە 400 ملیۆن پاوند لە ساڵدا وە دەست دێت. هەروەها دەوڵەتی بەرازیل لە ڕێگای توتنەوە (سیگار) لە ساڵدا 11.6٪ی داهاتی هەیە. بۆ وێنە لە 6 مانگی یەکەمی ساڵی 1983 ئەم وڵاتە 500 ملیۆن دۆلاری لە ڕێگای مالیات (باج) داهاتی بووە. بازرگانی بە جگەرە و توتن و قازانجەکانی وای کردووە تا ئەو ڕێگاچارانەی بۆ پێشگیری لە بەکارهێنان و بەرهەمهێنانی جگەرە گیراوەتەوە پێش هەموویان تووشی شکست بێن و سەرکەوتوو نەبن.

زیانە گیانییەکانی جگەرە لە سەرتاسەری جیهان زۆر زەق و بەرچاوە. بۆ وێنە لە وڵاتی بەرازیل لە ساڵێکدا 20,000 کەس بە هۆی نەخۆشی دڵ و 20,000 کەس لە

ڕێگای نەخۆشی شێرپەنجە دەمرن، کە هەموویان هۆکاری مردن و نەخۆشییەکەیان بۆ جگەرە و بەکارهێنانی دەگەڕێتەوە. هەروەها بەکارهێنانی جگەرە لەلایەن ژنانەوە بووەتە هۆکاری مردنی منداڵەکانیان هەم پێش لە دایکبوون هەم دوای لە دایکبوون.

بە پێی ئامارێك کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بڵاوی کردووەتەوە، 50٪ی قوتابیانی ناوەندی پێش کۆتایی قۆناغی ناوەندی جگەرە دەکێشن. هەروەها 25٪ی خەڵکی وڵاتی چین بە بەردەوامی جگەرە دەکێشن کە دەکاتە 300 میلیۆن کەس. ساڵی 1984 گەورەترین بەرپرسی پزیشکی و تەندروستی لە ئینگلیز لە ڕاپۆرتێکدا، نووسیویەتی: کێشانی جگەرە لە ساڵدا، دەبێتە هۆی مردنی 100 هەزار کەس لەم وڵاتە! هەروەها دەڵێ: جگەرە بکوژترین چەکی ئاشتیخوازە کە مرۆڤ دروستی دەکا.

دوکتور ((مایکل راسل)) لە ئەنیستیتوی پزیشکی دەروون (ڕوانپزشکی) لە لەندەن دەریخستووە، دووکەڵێك کە بەدوای بەکارهاتنی لە لایەن تووشبووان بەسیگار بڵاو دەبێتەوە لە وانەیە لە ساڵدا 1000 هەزار کەس. هەروەها بە پێی سەرچاوەکان لە وڵاتی ئەمریکا لە ساڵدا 340 هەزار کەس بەهۆی بەکارهێنانی توتن و جگەرە دەمرن!

زیانەکانی جگەرە تەنیا بەوە کۆتایی نایێت، بۆ وێنە 25٪ی ئەو ئاگرانەی لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی ئەمریکا، ڕوودەدا بە هۆی بەکارهێنانی جگەرەوە بووە و بە میلیارد دولار زیانی ئابووری بەو وڵاتەی گەیاندووە.

## نیشانەکانی تووشبوون بە جگەرە

جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی بە کێشانی جگەرە ڕاهاتوون کارێکی دژوارە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو کەسانەی لە ڕۆژدا، 20 دانە جگەرە دەکێشن یا بەیانی یا پێش نان خواردن و بە ڕێوەبردنی کاری ڕۆژانە یا کاتێك جگەرە ناکێشن

هەستێکی تایبەتیان بۆ جگەرە هەیە ئەوانە بەو دووکەڵە تووشبوون و لـە گـەڵی ڕاهاتوون. کەسێك بەردەوام جگەرە دەکێشێ نیشتیهای نانخواردنی کەم دەبێتەوە. هەموو کاتێك بۆنی جگەرە دەدا و قامکەکانی بە هۆی ((نیکۆتین)) زەرد دەبـن و هەموو کاتێ کۆخەیان هەیە. ئەوانەی لە سەرەتای شەو جگەرە دەکێشن لەوانەیە خەویان لێ نەکەوێ، لەبەر ئەوەی نیکوتین (ماددەیێکە کە لە نێو جگەرەدا هەیە) بێخەوی دێنێ.

## شوێنەواری تووتن (جگەرە) لەسەر تووشبووان

1- بەشێکی زۆر لە تووشبووان نەخۆشی شێرپەنجە دەگرن.
2- تێکچوونی جووڵەی خوێن.
3- نەخۆشییەکانی دڵ بە گشتی.
4- تێکچوونی مەعیدە.
5- ناسم (تەنگی نەفەس).
6- برونشیت و ناراحەتییەکانی سینوسی.
7- بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و زۆربوونی لێدانی دڵ.
8- زگچوون.
9- ژەهراویبوون بە نیکۆتین لەوانەیە گرفتـی زۆرتـر بـۆ تووشـبوو دروسـتبکا و نیشانەکانی ئەمانەن:

دڵ ئێشە، ڕشانەوە، سەرئێشە، عارەقە کردن، سەرگێژ و لاوازبوونی گشتی لەش.

10- کێشانی جگەرە لە لایەن ژنانی دوو گیان، دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکانیان بە کێشێکی کەم و نەخۆش لە دایکبن. هەروەها لەبار چوونی منـداڵ لـە نێـو ژنانی جگەرەیدا زۆرترە.
11- ئەو منداڵانەی دایك و بابیان جگەرەین بە بەراورد لەگەڵ منداڵانی دیکەدا، زۆرتر سەرمایان دەبێت و ڕیخۆڵەکانیان تووشی عفونـەت (ئیلتیهـاب) دەبـن و لەوانەیە لە داهاتوودا ڕوو لە ماددە هۆشبەرەکان بکەن.

## ڕێگا چارەکانی وازهێنان

ئەگەر تووشبوو (جگەرەکێش) بیەوێ واز لە جەگەرکێشان بێنێ، بۆ ئەم مەبەستەدا، دەبێ سەردانی پزیشکی تایبەتی بکاو ڕێنوێنی پێویست لەو بوارەدا وەرگرێ، لەسەر یەك تووشبوو بۆ وازهێنان لە جگەرەکێشان دەبێ پێرستێك لەو شوێنانەی کە جگەرەی تێدا دەکێشێ ئامادە بکا و ئەو شوێنەی کە جگەرەی زۆرتری تێدا دەکێشێ لە سەرەوەی ئەم پێرستە دابنێ و ئەو شوێنانەی کەمترین جگەرەی تێدا دەکێشی لە خوارەوەی پێرستەکە دابنێ. دواتر بەکارهێنانی جگەرە شوێن بە شوێن تەرك بکا (واز بێنێ) واتە ئەو شوێنەی جگەرەی کەمتری تێدا دەکێشێ لە پێشدا دەستپێبکا، تادەگاتە ئەو شوێنانەی زۆرترین جگەرەی تێدا دەکێشێ.

ئەو کەسانەی بۆ هێورکردنی خۆیان جگەرە دەکێشن لە کاتی وازهێنان دەبێ ئەو بۆشاییە بە شێوەیەکی دیکە پڕ بکەنەوە تا بۆ جارێکی تر روو لە جگەرە نەکەن. کەسانی جگەرەی لە کاتی وازهێنان بیر لەوە بکەنەوە وازهێنان چەند قازانجی ماددی و مەعنەوی هەیە. بۆ وێنە بەدوای ماوەیەك پارەیەکی زۆریان بۆ دەمێنێتەوە و لە بواری تەندروستییەوە وەزعیان باشتر دەبێ. بۆ منداڵەکانیان نموونەیەکی زۆرباش و سەرکەوتوو دەبن. تام و چێژێکی زۆرتر لە خواردن دەبەن و ددانیان پاك و خاوێن دەبنەوە و بۆنی جگەرەیان لە کۆڵ دەبێتەوە.

لە کاتی وازهێنان لەوانەیە تووشی هەندێك گرفت ببن وەکو: توورەبوون، ماندووبوون و بۆ ماوەیەك کێشی لەشیان دەچێتە سەرێ لەبەر ئەوەی لەم قۆناغەدا، خواردنی چاکیان پێ دەخورێ.

## کهول (جۆرەکانی مەشروب)

کهول (مەشروب) شلەمەنییەکی بێهۆشکەر و بەهێزە کە لەم سەردەمەدا، خواردنەوەی لە نێو خەڵکیدا زۆر باوە و وەکو خواردنەوەیەکی رۆژانە لەسەر

سفرەی نان خواردندا وەبەرچاو دەکەوێ. مرۆڤ بە درێژایی مێژوو ئەلکۆلی وەکو ماددەیەکی خۆراکی (خواردەمەنی) بەکاری هێناوە و لە بەراورد لەگەڵ ماددە بێهۆشکەری وەك کانابیس کە قەدەغەکراوە و مەترسییەکانی لە کهول کەمترە، ئەم شلەمەنییە زۆر بە ئاسانی لە دوکانەکان دەستدەکەوێ و هیچ چەشنە یاسایەك بۆ بەرهەمهێنان و خواردنەوەی دانەنراوە. تەنانەت خواردنەوەی ئەم شلەمەنی بێهۆشکەرە تێکەڵی جێژن و شایی و خۆشی خەڵکی تەواوی جیهان بووە و لە ڕێوڕەسمە تایبەتییەکاندا، وەکو خواردنەوەیەکی سەرەکی بەکاریدێنن، تەنانەت لە نێو بەشێکی زۆر لە ئاینییەکاندا خواردنەوەی زۆر ئاساییە، لەسەری ساڵی نوێ خەڵکی جیهان بە خواردنەوەی مەشروب و شکاندنی شووشەکانی مەشروب بە پێشوازی ساڵی نوێ دەڕۆن.

هەر لە کۆنەوە تا گەیشتوەتە ئەم سەردەمە خواردنەوەی جۆرەکانی مەشروب پەرەیسەندووە و ئەو پەرەسەندنە لە نێو ژنانیشدا، زۆر بووە. بازرگانی بەم شلەمەنییە، یەکێك لە هۆکارەکانی پەرەسەندنی لە نێو کۆمەڵدایە و ئەو پارەیە کە بۆ پروپاگەندە و ناسینی سەرف دەکرێ ئەو ڕاستییەمان پێ دەسەلمێنێ. تا ئێستا هیچ چەشنە هەوڵ و کوششێکی ئەوتۆ بۆ کۆنترۆڵ بڵاوکردنەوەی ئەم شلەمەنییە هۆشبەرە نەکراوە، بەڵام بەشێکی زۆر لە جووتیاران و بازرگانان لە ڕێگای بەرهەمهێنان و فرۆشی ئەم ماددەیە بوونەتە خاوەنی پارەیەکی خەیاڵی.

بە پێی بەڵگەکان، بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی شلەمەنییە هۆشبەرەکان ساڵ بە ساڵ زۆرتر دەبێ و بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە لەسەر 97 وڵاتی جیهان لە ساڵەکانی 1960 تا 1987 کراوە، بەرهەمهێنانی شلەمەنییە هۆشبەرەکان لە 60٪ زۆری کردووە. تەنانەت لەو وڵاتانەی کە خواردنەوەی قەدەغەیە، بەکارهێنانی بە شێوەیەکی زۆر خێرا چووەتە پێش. لەم سەردەمەدا، گرفتی بەکارهێنانی مەشروب لە وڵاتانی پێشکەوتوو زۆرترە، لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی ژنان و تازەپێگەیشتوان ڕوویان لە مەشروب خواردنەوە کردووە.

لەم سەردەمەدا، بەرهەمهێنان و فرۆشتنی مەشروب بووەتە بازرگانییەکی نێو نەتەوەیی. لە بەریتانیا بەکارهێنانی مەشروب لە 30 ساڵی رابردوو دوو هێندە زۆری کردووە. ئەم وڵاتە لە ساڵدا، 1000میلیۆن پاوند قازانجی لە ناردنە دەرەوەی مەشروب کردووە و تەنیا لە ساڵی 1983دا زیاتر لە 5000 میلیۆن پاوند باجی (ماڵیات) جۆرەکانی مەشرویی وەرگرتووە. لە هەندێك لە وڵاتانی دیکەدا، ئەو ژمارانە زۆرترە بۆ وێنە لە فەرانسە 10٪ی هێزی ئیشکەری وڵات لە رێگای بەرهەمهێنان و فروشتنی جۆرەکانی مەشروب بەرێوە دەچن.

لەم پیشەسازییەدا، پارەیەکی زۆر بۆ پروپاگەندەی بازرگانی و هاندانی خەڵکی بۆ بەکارهێنانی مەشروب سەرف دەکرێ و بۆ ئەو مەبەستەدا، بەهێزکردنی کاری سێکسی و پێگەی کۆمەڵایەتی دەکەن، باخود تا خەڵکی زۆرتر روو لە خواردنەوەی ئەم شلەمەنییە هۆشبەرە بکەن. هەر بۆیە دەبینین مەشروب وەك یەکێك لەدیارییە گرنگەکانی سەری ساڵ، جەژنی لە دایکبوون، رێوەرەسمەکان و... هتدپێشکەش دەکری. دەست پێ راگەیشتنی گشتی بەمەشروب، شوێنەوارێکی زۆری لە زۆربەی کێشەو گرفتی خەڵکی هەیە. زۆربەی بەڵگەکان ئەوە دەسەلێنێ کە لەو شوێنانەی کە مەشروب لە رێگای سوپرمارکێتەکان و فرۆشگاکان دەفرۆشرێ بەکارهێنانی زۆرتر بووە. هەرچەندە وەدەستهێنانی مەشروب ئاسانتر بێت، بە رادەیەکی زۆرتر روو لە بەکارهێنانی دەکرێ. لە (10) ساڵی رابردوودا، لە بەرامبەر هەر پیاوێك ژنێك بە خواردنەوەی مەشروب راهاتووە. بەڵام ئێستا ئەو بەراوردە سێ بە یەك بووە، واتە لەبەرامبەر سێ پیاودا ژنێك توشی مەشروب خواردنەوە بووە. توشبوون بە جۆرەکانی مەشروب لە نێو ژنانی سی تا پەنجا ساڵدا زۆر باوە. لە ماڵە پیشکەوتووەکاندا، کەژنان لە بێکاری و تەنیایی دەناڵێنن. بۆ ئەوەی لەو حاڵەتەیان بێنە دەر روو لە خواردنەوەی جۆرەکانی مەشروب دەکەن، دەکەونە داوی ئەم ماددەیە. ئەم جۆرە ژنانە بە هۆی یەك رەنگی ژیانیان، دڵەراوکێ و تەنیایی روو لە مەشروب دەکەن.

لە سەرەتادا بەلایانەوە زۆر ناسانە و بۆ وەدەستهێنانی هیچ چەشنە گرفتێك یـان نییە. تەنانەت رەنگە بە دزی مێردەکانیان خواردنـەوەیان پـێ سـەرکەوتن بێـت. بەڵام دواتر لەگەڵ ئەم خواردنەوەیە راهاتن وازهێنانی زۆر سەخت و دژوار دەبێت.

## گرفتی جەستەی

ئەو کەسانەی لـە خواردنـەوەی مەشـروبدا زیـادەڕەوی دەکـەن لەگـەڵ مەترسـی تووشـبوون بـە نەخۆشـی شـێرپەنجە، برینـی گـەدە، شـلبوونی ماسـوولکەکان و نەخۆشی جەرگ بەرەو روو دەبن. ئـەو ژنانـەی مەشـروبی زۆر دەخۆنـەوە، کـاتی دووگیـانی لەگـەڵ مەترسـی لەبارچـوون بـەرەو روو دەبـن و لەوانەیـە منداڵـە دواکەوتوو (گێل) یا بە کێشی کەم و لاواز لە دایك ببن. سەرەڕای ئـەوە مەترسـی تووشبوونی منداڵەکەیان بەنەخۆشی جـەرگ یـان هەیـە. شـوێنەواری مەشـروب لەسەر مێشك زۆر زەق و بەر چاوە، سێ چرکە دوای خواردنەوەی یەك دوو پەرداخ مەشروب، شوێنەواری لەسەر مێـشك دەردەکـەوێ و بـە خواردنـەوەی یـەك دوو پەرداخی دیکـە هەسـت بـەئازاد بـوونی زۆرتـر دەکـا و لـە بەرامبـەر بـەڵێن و پەیمانەکان و نەخلاقی ئینـسانیدا خـۆی بـە بـەرپرس نـازانی و کـۆنترۆڵی خـۆی لەدەستدەدا و زۆر قسە دەکا، لە مرۆڤێکی شەرمنەوە دەبێتەوە ئینـسانێکی زۆر توندوتیژ و هێندە جاریش شەڕانی. هاوکات لەگەڵ ئەمانە مێشك توانای کۆنترۆڵ و راگرتنی زانیارییەکانی نییە و دژکردەوەی ماسوولکەکان بـە بـێ ئـەوەی ئـەو کەسە پێی بزانێ لە بەین دەچێ. هەر بۆیە ئەو کەسەی مەشـروبی خواردووەتـەوە پێی وایە دەتوانێ زیاتر لە هێز و توانایی خۆی لە حاڵەتی ناسـایی خۆیـدا قـسە بکا، جم و جۆڵی هەبێ. بەڵام ئەو لە بـەرێوەبردنی هـەرکام لـەم ئیـشانەدا، زۆر لاواز بووە و ناتوانێ وەکو جـاران قـسە بکـا، جموجـۆڵی هـەبێ و... هتـد. لـە کۆتاییدا، شوێنەواری مەشروب لەسەر بەشەکانی دیکەی مێشك کە هەرکامەیان

هەڵسووڕێنەری بەشێکی لەشن دەردەکەوێ و ئەوکەسە سەرخۆش دەبێ و وردە وردە بەرەو حاڵەتێکی گێژی دەڕوا.

لە فەرانسە 10٪ی مردنەکان راستەوخۆ لە خواردنەوەی مەشروب سەرچاوەدەگرێ. لە بەریتانیا 20٪ی نەخۆشییەکان بە هۆی خواردنەوەی مەشروب لە نەخۆشخانە گشتییەکاندا خەوێنراون. لە وڵاتانی ئەمریکا، ئۆستralیا و ئەرژەنتین یەك لە سێ تا دوو لە سێی ئەو کەسانەی بە هۆی نەخۆشی دەروونییەوە دەچنە نەخۆشخانە ئەو کەسانەن لە خواردنەوەی مەشروب زیادەڕەوییان کردووە.

## مەترسییەکانی تووشبوون بە مەشروب

گەورەترین مەترسی مەشروب، تووشبوون و راهاتن بە خواردنەوەی ئەم شلەمەنییە. بە پێی ئامارێك کە لە لایەن رێکخراوی تەندروستی جیهانیدا، بڵاوبووەتەوە، نزیك بە 10٪ی دانیشتوانی جیهان بە خواردنەوەی جۆرەکانی مەشروب راهاتووە و لەو رێگایەوە هێزی خۆیان لە دەستداوە. کەسێك بە دوای دەستپێکردن بە خواردنەوەی ئەم ماددە هۆشبەرە نەتوانێ ئەندازەو سنوورێك بۆ خواردنەوەی دابنێ مانای ئەوەیە ئەو کەسە تووشبووە و خواردنەوەکەی لە رادە بەدەر بووە. بە پێی لێکۆڵینەوەکان لە هەر سێ کەسێك کە مەشروب دەخواتەوە کەسێکیان لەو دەستەیەیە، کە ناتوانێ لە کاتی خواردنەوەدا، خۆیان کۆنترۆڵ و لە خواردنەوەدا، زیادەڕەوی دەکەن.

مەترسییەکانی خواردنەوەی مەشروب یەکجار رووخێنەر و مەترسی مردنی بۆ هاوتەمەنەکانی خۆی چوار بەرابەر زۆرتر دەبێ. هەروەها بەشێکی زۆر لە رووداوەکانی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لە خواردنەوەی مەشروب سەرچاوە دەگرێ و تووشبووان بە مەشروب خواردنەوە لە بەراورد لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، زۆرتر تووشی نەخۆشییەکانی جەرگ و شێرپەنجە دەبن.

## قۆناغەکانی تووشبوون بە مەشروب

ئەو کەسانەی تووشی مەشروب خواردنەوە دەبن و لەگەڵی رادێن، لە سەرەتا لە نێو میوانییەکاندا، دەستپێدەکەن و بە شێوەیەکی خێرا بەو ناکامە دەگەن کە خواردنەوەی مەشروب لەکاتی ناراحەتییەکان، فشارەکانی ژیان و گرفتە دەروونییەکانی رۆژانە هێوریان دەکاتەوە، هەر بۆیە خواردنەوەی مەشروب رۆژ بە رۆژ زۆرتر دەبێ.

زیادەڕەوی لە خواردنەوەی مەشروب و تووشبوونی بەو ماددەیە دەگەڕێتەوە سەرچەند هۆ و کاریگەرییان لەسەر کەسانی راهاتوو زۆرە، بۆ وێنە تەمەن، رەگەز، پیشینەی بنەماڵەیی (ئەگەر دایك و باب مەشروبخۆر بن، مەترسی تووشبوونی منداڵ زۆرتر دەبێ) و کێشەی دەروونی دەتوانێ بەناو بەرین. هەرچەند تا راهاتن و تووشبوون رێگایەکی دوور و درێژی لەبەردەم دایە، بەڵام بە گشتی بۆ ئەو کەسانەی لەسەرەتای تووشبوونن قۆناغی دواتر زۆر ئاسان و وەك یەکی لێ دێت.

لە پێشدا، تووشبوو بە نهێنی دەستدەکا بە خواردنەوە و لە بەرامبەر خواردنەوەی خۆیدا، هەست بە گوناه دەکا. هەم بەیانییان و هەم شەوانە دەخواتەوە. کەم کەم ئەندازەو مەسرەفی بۆ زۆرتر هێدی بوون، بەرەو زیادبوون دەڕوا. لەوانەیە ئەوەندە بە خواردنەوە درێژە بدا تا لەشی تووشی نەخۆشی بێت. ژیانی خێزانی و پێگەی پیشەیی لەکەدار دەبێ. هەروەها لە چوارچێوەی بنەماڵەو کارو پیشەی دا، سەرکەوتوو نابێ و دەبێتە کەسێکی جنێو فرۆش. لەبەر ئەوەی برادەرەکانی لە دەست دەدا و لە ماڵەوە وەکو جاران وەریناگرن و پیشە و نیش و کاری خۆی لە دەست دەدا و بۆ ئارامکردنەوەی خۆی، خواردنەوە زۆرتر دەکا. لەم قۆناغەدا لەوانەیە روو لە هێرش و جنێو فرۆشی بکاو دەست بکا بە لێدان و برینداركردنی خێزانی (ژن و منداڵەکەی)، لێدانی ژن و منداڵ یەکێك لە شوێنەوارەکانی خواردنەوەیە. تووشبوو، هەمیشە بۆنی مەشروب دەدا و تێ دەکۆشێ بە بەکارهێنانی بۆنی جۆراوجۆر (عەتر) بۆنی مەشروب لە خۆی دوور بکاتەوە.

لەرزینی دەست لە نێو تووشبووان زۆر ئاساییە و دەبێتە هۆی ئەوەی بە جوانی نەتوانێ بنووسێ یا نیش و کارەکانی راپەڕێنێ. مەعیدە بە تەواوی ئیش ناکا. زۆرتر ناراحەتی ئەوەیە بە ئەندازەی پێویست مەشروبی دەستنەکەوێ هەر بۆیە هەموو کاتێ لە ماڵ یا لە شوێنی ئیش و کاریدا قاپێك مەشروب دەشارێتەوە. زۆرتر بە پەنهایی و دوور لە چاوی خەڵکی دەخواتەوە و سەبارەت بە خواردنەوەی خۆی درۆ دەکا و لەوانەیە بە هۆی زیادە رەوی لە خواردنەوە لە هۆش بچێ. بۆ وەدەستهێنانی مەشروب لەکاتی پێویست دەستدەکا بە دزی کردن و لەوانەیە هەرجۆرە مەشروبێك دەستی بکەوێ بیخواتەوە.

تووشبوو هیچ چەشنە گرنگییەك بە رواڵەت و سەرو چاوی خۆی نادات، نانی پێ ناخورێ، هەست بە ترس دەکا و لەشی بە تەواوی دەلەرزێ و لە وانەیە لە بەرامبەر مەشروب زۆر لاواز بووبێت لەم قۆناغەدا، جەرگی تووشبوو زۆر خراپتر دەبێ و بۆ سەرخۆشبوونی پێویستی بە مەشروبێکی کەمترە.

بینینی ئەم وەزعە لە نێو کۆمەڵدا، زۆر سەیرو سەمەرە نییە، لەبەر ئەوەی تووشبوون بە مەشروب زۆر باوە. بە پێی سەرچاوەکان تەنیا لە وڵاتی ئەمریکا لە نێوان 9 تا 10میلیۆن تووشبوو بە مەشروب هەیە و لە بەریتانیاش 3 میلیۆن کەس بە مەشروب راهاتوون (تووشبوون).

## شوێنەواری وازهێنان

لەو کاتەوە تووشبوو تێ دەکۆشێ ژیانێکی بێ مەشروب بەرێتە سەر، لایەنە خراپەکانی وازهێنان ئازاری دەدا. هەشت کاتژمێر دوای وازهێنان لەشی دەستدەکا بە عارەقە کردن و هەست بە نەخۆشی دەکات و دەست و لاقی دەلەرزێ، دواتر هەست بە گێژی دەکات و ئاگای لە خۆی نامێنێ. دەترسێ تووشی کابووس و وەهم و خەیاڵاتی جۆراوجۆر بێت. لەم حاڵەتەدا، لەشی

دەلەرزی و مرۆڤێکی تووڕەو تونلوتیژ دەبیَ. لەبەر ئەوەی ئەم حاڵەتە چەند ڕۆژێك دەخایێنیَ باشتر وایە تووشبوو لە شوێنێکی تایبەتیدا ڕاگیریَ.

## شوێنەواری کۆمەڵایەتی مەشروب

مەشروب سەرەڕای شوێنەواری لەسەر مرۆڤ، زەرەرێکی زۆر و نادیاری لەسەر کۆمەڵگا هەیە. ساڵی 1979 سی و دوویەمین ئەنجومەنی تەندروستی جیهانی ڕایگەیاند، ئەو گرفتانەی کە لە مەشروب سەرچاوە دەگرن، بۆ ئەو کەسانەی زیادەڕەوی لە خواردنەوەی دەکەن بە گرنگترین مەسەلەی تەندروستی گشتی جیهان دەژمێردریَ و مەترسییەکی زۆری بۆ تەندروستی و ژیانی مرۆڤ هەیە.

دەوتریَ نزیك بە 50٪ی کارەساتەکانی ئۆتۆمبێل لە جادەکان لە وڵاتانی پێشکەوتوو لە خواردنەوەی مەشروب سەرچاوە دەگریَ. مەشروب شوێنەواری خراپ لە لێهاتوویی و توانایی سیاسەتمەدار، بازرگان، پزیشك و هونەرمەندان دادەنیَ. یەك لە سێی تەواوی تەڵاقەکان (جیابوونەوەکانی خێزانی) و دەستدرێژی سێکسی بەسەر منداڵان لە خواردنەوەی مەشروب سەرچاوە دەگریَ. هەروەها لەساڵدا، 8 تا 15میلیون ڕۆژ ئیش بە هۆی خواردنەوەوە لە دەست دەڕوا. لەئەمریکا زیاتر لە 75٪ ی کاتی پۆلیس بۆ تاوانەکانی تووشبووان بە مەشروب بەفیڕۆ دەچێت. هەروەها نیوەی تاوانەکانی کوشتن لە خواردنەوە سەرچاوە دەگرن (واتە بکوژ یا کوژراو یەکێك یان هەر دوویان سەر خۆش بوون). لە بەریتانیا بەپێی ڕاپۆرتێك کە لە لێکۆڵینەوەی گۆڤارێکی ئەو وڵاتەداهاتووە (1982) 64٪ی دەستگیرکراوان دەوروبەری چوار کاتژمێر پێش گیرانیان مەشروب یان خواردووتەوەو93٪ی ئەو کەسانە لە نێوان کاتژمێر10ی شەو تا 2 بەیانی گیراون و لەخواردنەوەدا زیادەڕەوییانکردووە. هەروەها 65٪ی لاوانی گیراوی خوار 18 ساڵ خواردوویانەتەوە. لە بەریتانیا خواردنەوەی مەشروب هۆی سەرەکی گرتنی 1000 کەسە لە ڕۆژدایکدا.

## دەرمانە پزیشکییەکان

مادده هۆشبەرەکان لەکاری پزیشکیدا. کەڵکی زۆریان لێ وەردەگیرێ و بە درێژایی مێژوو پزیشکەکان بەکاری کیمیایی لەسەر مادده هۆشبەرەکان دەرمانی جۆراوجۆری پزیشکییان دروست کردووە و بۆ چارەسەری نەخۆشەکانیان بەکاریانهێناوە. ئەم دەرمانانە لە کورت خایەندا، کاریگەری باشیان هەبووە، بەڵام لە درێژخایەندا نەخۆش بەخواردنیان راهاتووە و نەیتوانیوە وازی لێ بێنێ و شوێنەواری تووشبوون  بە دەرمانانەش لە لەش و دەروونیان دا، زۆر بە زەق بەرچاودەکەوێ. لێرەدا ئاماژە بەگرنگترین دەرمانی پزیشکی کەبۆ چارسەرکردنی نەخۆشییەکان دروستکراون، بەڵام دواتر وەکو ماددەی هۆشبەرێکی بازرگانی کەڵکی لێ وەرگیراوە دەکەین.

### ئامفتامین

تێکەڵاوی کیمیایی ئامفتافین بۆ یەکەم جار ساڵی لە 1927 لە شاری لوس ئەنجلسی ئەمریکا دروستکراوە تا ساڵی 1930 لە ئاستێکی بەربلاو نەهاتە بازار، بەڵام هۆشبەری ئەم دەرمانە بە خێرایی دەرکەوت. کاتێك شوێنەواری دەروونی ئامفتامین بۆ یەکەمجار کەوتە بەرباس، خوێندکاران بە شێوەیەکی نارەسمی و یاسایی وەك دەرمانێکی هاندەر کەڵکیان لێ وەردەگرت. ئاسوالد (OSWSLD) وتاکور (THACORE) دووکەس لە لێکۆڵەرەوەکان لە ساڵی 1953 رایانگەیاند، ماوەیەکی زۆر بەدوای وازهێنان لە خواردنی ئامفتامین شوێنەواری ئەم دەرمانە لەسەر مێشك دەمێنێ. لە دەوروبەری شەڕە نیوخۆییەکانی ئیسپانیا، تێکەڵاوەکانی ئامفتامین لە نێو کۆڵی سەربازەکان وە بەرچاودەکەوت و لەماوەی شەڕی دووەمی جیهانیشدا، لایەنەکانی شەڕ لەم دەرمانە هۆشبەرە بۆ بەهێزکردن و زۆرکردنی توانای بەرگری سەربازەکانیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە. بۆنموەی سەربازەکانی ئینگلیزی بتوانن ماوەیەکی دوور و درێژ، درێژە بەشەڕبدەن،

دەوربەری72میلیۆن حەبی ئامفتامینیان پێ درابوو. هەروەها پەرەشوتەوانانی ئاڵمانی بۆ وەدەستهێنانی هێزی زۆرتر کەڵکیان لێ وەرگرت. لەژاپۆن نەتەنیا لەکاتی شەڕەکان کەڵکیان لێ وەردەگرت، بەڵکو لەکارخانەکاندا بۆ زۆر بوونی بەرهەمی کرێکاران مەسرەف دەکرا.

بەدوای شەڕی دووەمی جیهانی، زۆربەی خەڵك بۆیان دەرکەوت تێکەڵاوی ئامفتامین دەبێتە هۆی کەمبوونی ئیشتیا و بۆکەمکردنەوەی کێشی لەش باشە. پسپۆران بە شێوەیەکی رەسمی بۆیان دەرکەوت بەکارهێنانی ئەم ماددەیە گرفت و شوێنەواری خراپی بەدواوە دەبێ. لەبەر ئەوەی بەکارهێنەرانی ئەم دەرمانە هۆشبەرە دوای کەمبوونەوەی شوێنەواری تووشی خەمۆکی، بێدەسەڵاتی دەبن بۆ لەبەینبردنی خەمۆکی خۆی پێویستیان بە بەکارهێنانی زۆرتری حەبەکانی ئامفتامین دەبێت. لە هەموو جیهان هەوڵێکی زۆر بۆ کۆنترۆڵی مەترسیداری تووشبون بە ئامفتامین بەڕێوە چووە کە سەرکەوتووترینیان لە وڵاتی ژاپۆن بەڕێوەچووە. بەم شێوەیە یاسایەك بۆ کۆنترۆڵی بەکارهێنانی ئامفتامین دەکرا و زیاتر لە 17 هەزار کەس لەو پەیوەندییەدا دەستگیر کران. لەبەر ئەوەی رادەی تووشبووان کەمی نەکرد ژاپۆنییەکان خەباتێکی بەر فراوانیان دژ بەم دەرمانە هۆشبەرە دەستپێکرد، کە ئاکامەکەی زۆر سەرکەوتووانە بوو. سەرەتا لە ساڵی 1955دا، 29 کەس بە هۆی کوشتن، کە لە بەکارهێنانی ئامفتامین سەرچاوەی دەگرت گیران، بەڵام تا ساڵی 1957 ئەم ژمارەیە گەیشتە سفر لەبەر ئەوەی زیادەڕەوی لەبەکارهێنانی ئامفتامین زۆر کەمی کردبوو. لە ئینگلیز خەباتێکی لاواز دژی ئامفتامین بەڕێوەچوو، ساڵی 1954 گەورەترین بەرپرسی پزیشکی وەزارەتی تەندروستی ئەم وڵاتە ئامفتامینی بە ماددەیەك کە هۆشبەر نییە ناوبرد. ساڵی 1959 هەر لەم وڵاتەدا 2.5٪ تەواوی دەرمانەکان تێکەڵاوێکی ئامفتامینی تێدا بووە و سەیر ئەوەیە لە هەمان ساڵدا 5,600,000 حەب یا دەرزی ئامفتامین دەرخواردی نەخۆشەکان دراوە. یەکێك لە هۆیەکانی سەرکەوتوو

نەبوونی کۆنترۆڵی ئامفتامین لە ئینگلیز و هەندێك وڵاتی دیکە دەگەڕێتەوە بۆململانێی نێوان پزیشکەکان لەسەر ئەوەدا، ئامفتامین هۆشبەرە یان نا. پزیشکەکان و کۆمپانیاکانی دەرمان دەیانویست ئامفتامین لە بازاڕدا بمێنێتەوە بۆ ئەو مەبەستەش دەیانگوت ئەم دەرمانە هۆشبەر نییە و تەنیا پێ رادێن و تەنیا لەبواری دەروونییەوە بەکارهێنانی پێویست دەکا. ئەم هەڵویستە لەبواری مادديیەوە قازانجێکی زۆری بۆ پزیشك و بازرگانانی ئەم ماددەیە بە دواوەبووە. لە ئینگلیز گرفتی ئامفتامین لە ساڵەکانی دەیەی 1950 و 1960 بە شێوەیەکی بەربڵاو، بڵاوبوویەوەو تا ساڵی 1966 پزیشکەکان لە خزمەتی تەندروستی نەتەوەییدا لە ماوەی ساڵێکدا، 200 میلیۆن ئامفتامین یان بۆ نەخۆشەکان نووسی بوو. زۆربەی ژنانی تەمەن ناوەندی لەم وڵاتەدا بۆ وەدەستهێنانی ئامفتامین بەڵگەنامەی پزیشکیان ساختە دەکرد. لە ئەمریکا بارودۆخەکە زۆر لەوە خراپتر بوو. لەبەر ئەوەی بەپێی ئەو ئامارانەی لە لایەن بەرێوەبەری کۆنترۆڵی خواردن و دەرمانی ئەم وڵاتە راگەیەندراوە، لە ساڵی 1966 زیاتر لە 25تۆن ئامفتامین (نیوەی بەرهەمی نێوخۆیی ساڵ) لە رێگای نایاسایی و قاچاغ بڵاوبووەتەوەو هەر ئەمریکاییەك 14حەبی ئامفتامینی وەبەرکەوتووە. بە پێ ئەو سەرچاوانە لەشاری نۆکلاهاما ساڵی 1966 لە دانیشتوانی 300,000 کەسی ئەو شارە 5000 کەس تووشبووی ئامفتامینی هەبووە.

بەرادەیەکی زۆر خەڵکی کەوتبوونە داوی ئامفتامین و بە میلیۆنان کەس، ئامفتامینی پێویستی خۆی لە رێگای بازاری رەش و قاچاغ وەدەستدەهێنا. تا ساڵەکانی دەیەی 1960 لاوانی ژێرەوەی 18 ساڵ، ئامفتامین کە پێیان دەگوت دڵی پەمەیی بەشێوەی راستەوخۆ مەسرەف دەکرد. ئەوان ئەم دەرمانە هۆشبەرەیان بەمەبەستی وەدەستهێنانی هێزی پێویست بۆ بەشداریکردن لە میوانییەکانی شەوانە و لابردنی ماندوویەتی کە لەئیش و کاری قورسی رۆژانە سەرچاوەی دەگرت بەکاریاندەهێنا. لە دەیەی 1960 کاتێك یاسایەك بۆکۆنترۆڵی

بەربلاوی هیرۆیین دەرچوو، بەکارهێنانی ئامفتامین (تەزریق بـۆ نێـو دەمارەکـانی خوێن) بە شێوەیەکی سەرسوورهێنەر زۆری بوو. لە دەورووبـەری 1970 کێـشەی تووشبوون بە ئامفتامین زۆربـەی دەوڵەتـەکانی نیگـەرانکرد. بـەڵام کارگـەکانی دەرمانی لەبەرهەمهێنانی تێکەڵاوەکانی ئامفتامین و پروپاگەندەی بازرگـانی بـۆ ناسین و چۆنیەتی بەکارهینانی ئـەم دەرمانـە وەك یارمـەتی بەدابـەزینی کێـشی لـەش، خۆیـان نەپاراسـتووە. لـە ئـەمریکا گروپـی دژبـە بـەکارهێنانی ئامفتامینییەکان کە دەسەڵات و نفووزی زۆریـان هـەبوو، لەویلایـەتی نیویـۆرك بەپەسەندکردنی یاسایەك، بەکارهێنانی ئامفتامین بەمەبەستی کەمکردنی کێشی لەش قەدەغەکرا. لە ئینگلیـز دوو دەرمـانی دوروفێـت (DUROPHET) و دکـس درین (Dexidrine) کە هەردوویان لە تێکەڵاوی ئامفتامین دروستکرا بـوون، تـا ساڵی 1980 بە شێوەی ئازاد لە نێو بازارەکان دا، فروشراوەو بـە شـێکی زۆر لـە پزیشکەکان بە دانی ئەم دەرمانـە بـە نەخۆشـەکان و وەرگرتنـی پارەیـەکی زۆر، ژیانێکی زۆر پێشکەوتوو و دەوڵەمەندیان بۆخۆیان دروستکردبوو.

لەم سەردەمەدا، لە ئامفتامین بۆ چارەسەری کێشی لـەش کـەڵکی لێوەرنـاگیرێ (تەنیا لە یەك کاتدا ئەویش بۆ چارەسەری نەخۆشی نارکولپـسی (Narcolepsy) کە دەبێتەهۆی خەوی لەناکاو، هەر بۆیە نەخۆش پێویستە بۆ وەبەخەبـەر بـوونی خۆی ئامفتانین بەکاربێنێ) سرنج راکێش ئەوەیە تووشبووان بۆ ئەوەی پزیشکەکان ئەو دەرمانەیان بۆ بنووسن لاسایی نەخۆشێکی نارکولپسی دەکەنەوە.

لەم سەردەمەدا بە سەدان هەزار کەس تووشبوو بە ئامفتامین هەیە و لە ساڵێکدا 4 میلیۆن حەبی ئامفتامین بە شێوەی یاسـایی بـەکاردێنن و بەشـێکی دیکـەش ئامفتامینی پێویستی خۆیان لە رێگای نایاسایەوە وەدەست دێنن.

## نیشانەکانی تووشبوون بە ئامفتامین

تووشبووان بە ئامفتامین بە هۆی کەم ئیشتلیی کز و لاواز و هەروەها دڵناسك دەبن و ئارام و قەراریان نامێنێ و بێ خەو دەبن. زۆربەی تووشبووانی ئەم دەرمانە لە ڕێگای زارەوە ئامفتامین بەکاردێنن و هەندێکیش لە ڕێگای دەرزییەوە لە خۆیانی دەدەن. لەم کاتەدا شوێنەواری دەرزی لێدان لەسەر دەرمانەکانی خوێن نیشانەی تووشبووانە. باوترین شوێنی لەش بۆ دەرزی لێدان مەچەکە، دوای ماوەیەك دەرمانەکانی ئەم بەشەی لەش بریندار دەبن و شوێنی دیکە بۆ بەرێکردنی ئامفتامین بۆ نێو دەرمانەکانی نامێنێ، تووشبوو. لەهەر شوێنێکی دیکەی لەش بۆ ئەم مەبەستە کەڵك وەردەگرێ. ئەو تووشبووانەی خاڵەکانی تەندروستی لەکاتی دەرزی لێدانی ئامفتامین لەبەرچاو ناگرن تووشی نەخۆشی دەبن و دەمارەکانیان و ئەو شوێنەی ئامفتامین یان دەرزیان لێداوە ئیلتیهاب دەکات.

تووشبوو لە ژیانی خۆیدا تەنیا یەك ئامانجی هەیە، ئەویش وەدەستهێنان و بەکارهێنانی ئامفتامین. ئەوان هۆگرییان بە خێزان، ئیش و برادەرەکانی نامێنێ و زۆر جاریش ڕاست وێژی و دروستکاری خۆیان لەدەست دەدەن. ئەگەر تووشبوو لە کاتی کڕینی ئەم دەرمانە، پارەی پێویستی پێنەبێ، لەوانەیە دزی بکات تەنانەت لە خزم و کەسوکار و برادەرانی. بەڵێن دەدەن و دواتر جێبەجێی ناکەن. ئەم تووشبووانە زۆرجار بە هۆی ساختەکردنی بەڵگەنامەی پزیشك دەکەونە بەر بەدواکەوتنی هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس.

## شوێنەواری بەکارهێنانی بەردەوام

ئامفتامین ئەگەر لە ماوەیەکی درێژخایەن بەکاربێت، جەرگی تووشبوو تووشی نەخۆشی دەبێت و گرفتی دەروونی زۆری بۆ دروست دەبێ و تووشی وەهم و خەیاڵی زۆر دەبێت.

## شوێنەواری وازهێنان

تووشبووان، ئەگەر بیانەوێ واز لە بەکارهێنانی ئامفتامین بێنن، لەگەڵ بێخەوی، ماندوویەتی بیانوو گرتن و خەمۆکی بەرەو روو دەبن.

## وازهێنان

ئەگەر کەسێك بە رێنوێنی پزیشك دەستی بە بەکارهێنانی یاسایی ئامفتامین کردووە، پێشنیار دەکەین پزیشکی خۆی بگۆڕێ. زۆربەی پزیشکەکان بەکارهێنانی زۆری ئامفتامین رەت دەکەنەوە و لەو بڕوایەن، بۆ یارمەتیدانی نەخۆشەکە دەبێ رادەی ئامفتامین رۆژبەرۆژ کەم بکەنەوە. بۆ کەمکردنەوەی خەمۆکی دەروونی و لەکاتی وازهێنان، پێشنیار دەکرێ لە ماوەی هەر دوو هەفتەیەك خەرجی ئەم دەرمانە هۆشبەرە ببێتە نیوە.

ئەگەر ئامفتامین بە شێوەی نایاسایی وەدەستهاتووە و بەکاربراوە، دەبێ لەگەڵ پزیشکی خۆمان بۆ وازهێنان داوای یارمەتی بکەین و تەواوی راستییەکان لەو پەیوەندییەدا باس کەین. لە وازهێنانی ئامفتامیندا، هەروەك ماددەکانی دیکە، هۆکار و چۆنیەتی دەستپێکردن و تووشبوون زۆر گرنگە و ئەگەر ئەو هۆکارانە دیسان دووبارە ببنەوە لەوانەیە دیسان دەست بە بەکارهێنانی ئامفتامین بکاتەوە.

## باربی چوریت (باربی توریت)

ئەسید باربی چوریت بۆ یەکەجار لە ساڵی 1864 بەهۆی ((ئادولف فن بایر)) کە ئەوکات لێکۆڵەرەوێکی کیمیایی بوو، لە شاری گنت (Ghent) دروستکرا. لەو کاتەوە بە دواوە زیاتر لە 25 هەزار جۆر باربی چوریت دروستکراوە کە نیزیك بە 500 جۆری بۆ بەکارهێنان هاتووەتە بازاڕ. ئەم دەرمانە بۆ یارمەتیدانی کەسانی دەمارگیر و پەرێشان یا وەکو حەبێکی خەوهێنەر بۆ ئەو کەسانەی لە بێخەویدا، دەناڵێنن دەدرێ و بە بێشك وەکو دەرمانێکی هێدی کەرەوە شوێنەواری خۆی هەیە.

له سەرەتای 1950 کاتێك نووسەرێك له نێو کتێبی خۆیدا، تووشبوون بـه بـاربی چوریت مەترسیدارتر لـه مـورفینی دانـابوو، بـۆ یەکـەمجار ئـەم دەرمانـه وەکـو مەسەلەیەکی گرینگ هاتەبەر باس. لێکۆڵینەوەیەك لـه ناوەنـدی لێکۆڵینـەوەی تەندروستی گشتی جیهانی بۆ تووشبوون لـه ویلایـەتی کنتـاکی تاقیکارییـەکی گـرینگ لەسـەر پێـنج کـەس لـه تووشـبووان بـه بـاربی چـوریت کـرد و لـەو تاقیکارییەدا، سێ مانگ بەدوای وازهێنان له بەکارهێنانی ئەم دەرمانه تووشـی نەخۆشی دەروونی، گرژی بووە.

سـاڵی 1970 دەرکـەوت بـه سـەدان کـەس بـه بـاربی چـوریت راهـاتوون و بەکاریـدێنن. دکتـور «ئێـف، ئـۆ. ولـز- Dr, F,O. Wells» کـه لـه شـاری «ئیپـسویچ- Ipswich» نیـشتەجێیە، لـه گۆڤـاری پزیـشکی گـشتییەکانی کالیجی پاشایەتی ئینگلیز له ساڵی 1973دا وتارێکی نووسیووە، لەو وتـارەدا ئەو لەگەڵ هاوکارەکانی بەبێ جیاوازی نەخۆشەکانی تووشبوو به باربی چـوریت به هۆی نەگەیشتنی ئەم دەرمانە، تووشی گـرژی لـەش دەبـن و دەبێتـه هـۆی مەترسی جیدی خۆکوژی. هەر بۆیـه داوا دەکـەن بـۆ هـیچ نەخۆشـییەك لـەم دەرمانه بەکارنەهێنن. دەوترێ له ئەمریکا باربی چـوریت لـه سـاڵدا، دەبێتـه هۆی مردنی 10000 کەس و ساڵی 1972 ئەم دەرمانه بووەته هـۆی خۆکـوژی 1000 کەس له ئینگلیز.

پزیشکێکی دەروونناسی ئەمریکی توانی بۆ چارەسەرکردنی ئـەو تووشـبووانەی تەمەنیان له سەرەوەی 50 ساڵدایه و تووشی لەبیرچوونەوە (فەرامۆشی) و گێژی ببوون، شێوە دەرمانێکی نوێ بدۆزێتەوە، ئەویش دوورکردنەوەی ئەم نەخۆشانه له چنگ تووشبوون به باربی چوریت بووە. بەشێك له پزیشکەکانی جیهان ئـەم تاقیکاریـەیان لـه شـاری «لکـسینیگتون» وەرگـرت و دەریانخـست کـه تێکەڵاوەکانی دەرمـانی بـاربی چـوریت بەرادەیـەکی زۆر تووشـبوون دێنـێ و دەرمانێکی زۆر مەترسیدارە

سالّی 1975 له ئینگلیز دەوروبەری 500.000 کەس بە شێوەی ڕێکوپێك تێکەڵاوەکانی باربی چوریت یان بەکاردەهێنا و 100.000 کەسیان تووشبوون و لەگەڵ ئەم دەرمانە هۆشبەرە ڕاهاتوون. پسپۆڕان بۆیان دەرکەوتووە، تێکەڵاوەکانی باربی چوریت هەرچەند لە سەرەتادا، هەروەك مەشروب شوێنەواری کاتی هەیە، بەڵام دەبێتە هۆی لە بەین چوونی کەسایەتی و دروستبوونی ترس و دڕندەیی. بەوحاڵەش بە هەزاران پزیشکی گشتی ئێستاش بۆ ئەو نەخۆشانەی گرفتی بێخەوی یان هەیە یا پێویستیان بە ئارامی دەماریی هەیە لەسەر ئەزەری پزیشك تێکەڵاوەکانی باربی چوریت بەکاردێنن.

لە کۆتایی ساڵەکانی 1970 خەباتێکی ئارادەیەك سەرکەوتووانە دژی تێکەڵاوەکانی دەرمانی باربی چوریت لە وڵاتی ئینگلیز لە ئارادا بوو، کەبە هۆی گروپێکی بچووك لە پزیشکەکان کە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك ڕێکخراو بوو، ئەوان لەسەر ئیشی خۆیان سووربوون و ئەم خەباتەیان زۆر بە جوانی بەڕێوەبرد. ئامانجی ئەم گروپە خەباتگێڕە دژی بەکارهێنانی تێکەڵاوەکانی باربی چوریت و کەمکردنەوەی مەسرەفی ئەم دەرمانە بوو، کە بە کورتی پشتگیریان (CURB) پێ دەگوت. ئەم هەوڵ و کۆششە بە بڵاوکردنەوەی ئامانجەکانی خۆی لە نێو ئەندامانی پزیشکی یارمەتیکرد و لە ئاکامی ئەم خەباتەدا، بەکارهێنانی ساڵانەی باربی چوریتی کەمکردەوە تا گەیشتە 500.000 دانە لە ساڵدا (لە ئینگلیز). لە ئاکامدا ئەو تووشبووانەی دەستیان بە حەبەکانی باربی چوریتدا ناگات و هەر بۆیە ڕوو دەکەنە بازاڕی ڕەش و کەمبوونی ئەم دەرمانە دەبێتە هۆی زۆربوونی هاتنەژووری نایاسایی هیرۆئین. بەڵام ئەو تووشبووانەی کە لەگەڵ پزیشکی خێزاندا، هاوکاریان کردووە و بەکارهێنانی تێکەڵاوەکانی باربی چوریت کە بە بڕوای پزیشکەکان کۆن و باوی نەماوە ڕادەگرن و ڕوو دەکەنە تێکەڵاوەکانی دەرمانی بێنزۆ دیازپام کە دەرمانێکی ئارام کەرەوەی ڕۆژە.

لە سەرەتای ساڵەکانی 1980، ئەو پزیشکانەی تێکەڵاوەکانی باربی چوریتیان دەدا بە نەخۆشەکانیان بەرەو کەمبوون دەچوو، لە ساڵی 1984 رادەی پسولەی بەکارهاتووی ئەم دەرمانە بۆ ئەو کەسانەی پێشتر باربی چوریتیان بەکارنەهێنا بوو تا 76000 کەمی کردبوو. بەو حاڵەش هێشتا بە هەزاران کەسی تووشبوو بە باربی چوریت بە شێوەی رێکوپێك ئەم دەرمانە لە رێگای پسولەی پزیشك بەکاری دێنن.

بێگومان کاتی مەسرەف و بەکارهێنانی باربی چوریت لە ئینگلیز کۆتایی پێهاتووە و تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە پزیشکە بە تەمەنەکان هێشتا بۆ چارەسەری پەرێشانی و بێ خەوی ئەم دەرمانە بەکاردێنن. تووشبوون بە باربی چوریت لە ساڵەکانی 1960 تا 1970 بە گرفتێکی گەورە دەژمێردرا، ئێستا ئەو تووشبوونە جێی خۆی داوەتە تێکەڵاوەکانی بێنز و دیازپام (لە ئینگلیز)، بەڵام لە زۆربەی وڵاتانی دیکەی جیهان تووشبوون بە تێکەڵاوەکانی باربی چوریت هێشتا گرفتی رۆژە.

## نیشانەکانی تووشبوون

تووشبووان بە تێکەڵاوەکانی دەرمانی باربی چوریت بەردەوام لە نەخۆشییەکانی ئەم دەرمانە هۆشبەرەوەك: لەرزینی ئەندامانی لەش، تووڕەیی، بێخەوی، گرژی، پەرێشانی و هەستیاربوون لە بەرامبەر هەموو شتێك، دەناڵێنن. ئەوان جاروبار لە هۆش دەچن، زۆر بەسەختی هەست و هۆشیان کۆدەکەنەوە، لە رادەبەدەر تووشی کارەساتی لێخورینی ئوتومبێل دەبن و زۆریان پێخۆشە ژیانی نهێنی بەرنەسەر و لە تەنیاییدا بمێنن. تووشبووان بەم ماددەیە، ئەگەر بە شێوەیەکی نایلسایی دەرمانی پێویستی خۆیان بکڕن، تووشی گرفتی ماددی دەبن و لەوانەیە روو بکەنە دزی کردن تەنانەت لە دۆست و برادەر و ئەندامانی بنەماڵەی خۆیان. بە گشتی نەخۆشییەکانی تووشبووان بە باربی چوریت هەروەك تووشبووان بە مەشروب.

لـە درێژخایەنـدا، گـرژی، ناڵۆزیـیـە دەروونییـەکان، هـەروەها خـەمۆکی لـە بەکارهێنانی باربی چوریت زۆرتر دەبێـت. بـەکارهێنانی لـە رادەبـەدەری بـاربی چوریت لە کۆتاییدا مردنی بـە دواوە دەبـێ و تەنانـەت بـۆ یـەکجار زۆرکردنـی مەسرەفی ئەم دەرمانە لە وانەیە تووشی مردن بن.

## شوێنەواری وازهێنان

ئەو تووشبووانەی کە روودەکەنە وازهێنانی ئەم دەرمانە هۆشبەرە، لەوانەیـە لـە بێخەوی و دێوەزمەی شەوانە، زۆر پەرێشان و حەساس بن و لە لەرزینی لەشـیان بناڵێنن. لە وانەیە تووشی گرژی و جەڵتە بن. بە گـشتی شـوێنەواری وازهێنـان هەروەك وازهێنانی مەشروبە. شوێنەواری وازهێنان لەو تووشبووانەی ماوەیـەکی دووردرێژ باربی چوریت یان بەکارهێناوە، بە دوای چەند رۆژ دەردەکەوێ.

## چۆنیەتی وازهێنان

پێشنیار بۆ ئەو کەسانەی باربی چوریتی لەسەر رای پزیشك بەکارهێناوە ئەوەیـە پزیشکی خۆتان بگۆڕن. بەشـێکی زۆر لـە پزیـشکەکان بـەکارهێنانی زۆری ئـەم دەرمانە رەت دەکەنەوە و لە وازهێناندا بڕوایان بە کەمکردنەوەی دەرمـان هەیـە. لەو کاتانەی تووشبوو باربی چوریتی لە رێگای نایاسـایی بەدەسـتهێناوە، پێـشنیار ئەوەیە ئەم گرفتە لەگـەڵ پزیـشکی خـۆی بـاس بکـات و دڵنیـابن ئـەو داننانـەی تووشبوو یارمەتییەکی زۆر بۆ وازهێنان و هەروەها هەڵوێستی پزیشك بۆ وازهێنـان دەدات. وازهێنانی ئەم دەرمانە لەوانەیە تووشی جەڵتەو لەهۆش چـوونی لـە دواوە بێت هەر بۆیە پێشتر دەبێ لەسەر رای پزیشك و رێنوێنییەکانی ئەو واز بێنن.

خاڵی گرنگ لە دەرمانی تووشـبووان، ئەوەیـە نابـێ تووشـبوو، بـە یـەکجاری لـەم ماددەیە بێبەش بکرێ و دەبێ وردە وردە لە ماوەیەکی دیاریکراودا بەکارهێنانی کەم

بکاتەوە. کاتی پێویست بۆ وازهێنــان بەســتراوەتەوە بــە رادەی مەســرەف، مــاوەی تووشبوون و جۆری باربی چوریتی بەکارهاتوو. کاتی وازهێنان هــەروەك ماددەکــانی دیکە دەبــێ روون ببێتــەوە بــۆ و لەبەرچــی تووشــی ئــەم ماددەیــە بــووین. ئەگــەر هەلومەرجی، شوێن و ئەو هۆیانــەی تووشــبوونی بــە دواوە بــووە لانەچــن لەوانەیــە تووشبوو، دوای وازهێنان دیسان روو بکاتەوە مەسرەفی ئەم دەرمانە هۆشبەرە.

## بێنزودیازیپام

ساڵی 1954 دوکتۆر ((لیواچ ئسترن بــاك- Dr. Leo. H. Sternbach)) کــە لــە ویلایەتی نیوجرســی ئــەمریکا ئیــشی دەکــرد، بــە دوای تاقیکــاری لەســەر دوو مــاددەی کیمیــایی بــە ناوەکــانی ((بێنزوفنــون)) و ((هیپتــوکس دیــازین))، کــە ماوەیــەکی زۆری خایانــد و تەنانــەت دواتــریش ناهومێــد ببــوو، ســاڵی 1957 بەرهەمی ئەو تاقیکارییە ماددەیەکی نوێ بە ناوی بێنزودیازیــپام بــوو دۆزیــەوە. ئەم ماددەیە وەك دەرمــانێکی خەوهێنــەر نارامبــەخش و دژە ئــازار ناســراو لــە بەهاری ساڵی دواتر بە ماددەیەکی تەواو نوێ ناسرا.

لەو کاتە بە دواوە، هەمو شتێك بە خێرایی بەرەو پێش دەچــوو، بێنزودیازیــپام وەك: دەرمانێکی نارامبەخشی بەهێز، دژی لەرزینی لــەش و چارەســەرکردنی پەرێــشانی دەرکەوت. پــێش گەیــشتنی مارســی 1960، تــەواوی تاقیکارییــە ســەرەتاییەکان لەسەر ئەم ماددەیە بەڕێوەچوو، بــە دوای ئــەم ســەرکەوتنە لــە لایــەن بەڕێوەبــەری مەوادی خواردن و دەرمانی ئەمریکا لە بازاڕدا، بە ناوی ((لیبریوم)) بڵاو بووە.

یەکــەمین دەرمــانی بێنزودیازیــپام ســەرکەوتنی وەدەســتهێنا. لــە مــاوەی چــەند مانگدا، کۆمپانیای دەرمانی ((روش)) و کۆمپانیاکانی دیکە بەدوای جۆرەکــانی ئەم دەرمانە نوێیە کە سەرکەوتنی وەدەست هێنــابوو دەگــەڕان و دەرکــەوت ئــەم دەرمانە نوێیە پەرێشانی لە بەین دەبات و لە خەوتن و نارامکردنی توندوتیژی و

حەسانەوەی ماسولکەکاندا، کاریگەری زۆرە. تێکەڵاوە دەرمانییەکانی نوێی بێنزودیازێپام بە خێرایی بڵاو بووە. ساڵی 1963 ((ڤالیوم)) هاتە بازاڕ. بە پێی سەرچاوەکان ساڵی 1979دەورووبەری 700 جۆر بەرهەمی دەرمانی وەك ڤالیوم گەیشتە دەستی خەڵکی.

ئەم دەرمانە نوێیە، لە نەخۆشخانە و عیادەکان لە لایەن پزیشکەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار هاتووە و وای بۆ دەچوون سەرەڕای کاریگەری لەسەر نەخۆش هیچ چەشنە مەترسییەکی نەبێ و ئەو پزیشکانەی لە مەترسییەکانی باربی چوریت ترسیان هەبوو، دەستیانکرد بە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە نوێیە.

لە کۆتاییەکانی ساڵانی 60 دا، تێکەڵاوەکانی دەرمانی بێنزودیازێپام و دەرمانە وێچووەکانی دیکە نیزیکەی 5.6٪ی لە تەواوی ئەو دەرمانەی بووە کە لە لایەن پزیشکەکانەوە بە نەخۆش دراوە پێکهێناوە. ساڵی 1977 45 میلیۆن پسوڵەی پزیشك لە دەرمانەکانی نارامبەخش بە نەخۆشەکان دراوە، ((لیبریوم)) و ((ڤالیوم)) دەورووبەری یەك لە پێنجی تەواوی عیلاجەکانی پێك هێناوە. رووکردنی خەڵکی بە تێکەڵاوەکانی دەرمانی بێنزودیازێپام لە سێ هۆی سەرەکی سەرچاوەی دەگرت.

یەکەم: زۆری پزیشکەکان وا تێگەیشتبوون و فێرکرابوون کە تەواوی زانیارییەکانی تایبەت بە دەرمانە بەکارهێنەرەکانی خۆیان لە کۆمپانیاکان وەرگرن. ئەگەر یەکێك لە کۆمپانیاکانی دەرمان بە پزیشك پێشنیار بکا، فلانە دەرمان بۆ فلانە نەخۆشی بەکارەو مەترسی نییە، پزیشك ئەم زانیارییەی بەبێ لێکدانەوە وەردەگرێ.

دووەم: کاتێك دەرمانی بێنزودیازێپام هاتە بازاڕ، پزیشکەکان بۆ لەبەرچاو نەگرتنی ئەو مەترسییانەی لە تێکەڵاوەکانی دەرمانی باربی چوریت گرفتیان هەبوو. ساڵی 1970 بەڵگەیەکی زۆر هەبوو، دەریخست باربی چوریت گرفتی گەورەی تووشبوون پێکدێنێ و پێویستە جێگرەوەیەك بۆ

ئەم دەرمانە بدۆزرێتەوە. تێکەڵاوەکانی بێنزودیازێپام بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشانکران.

سێهەم: پزیشکەکان، لە نوسخەکانی خۆیان (نووسینی عیلاج بۆ نەخۆش) پێویستییەکی زۆریان بە بێنزودیازێپام بوو. ئەوان هیچ جۆرە ئامووزشێکی تایبەتی بۆ بەربەرەکانی لە بەرامبەر گرفتی دەروونی نەخۆشیان نەدیبوو و زۆربەیان سەبارەت بە پەرێشانی، ناهۆمیدی و نەخۆشییەکانی جەستەی/ دەروونی شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبوو، لەبەر ئەوەی ماوەی ئامووزش و فێربوونی دەروونناسی یان لە خوێندنگاکانی پزیشکی لە نێوان ساڵەکانی 1960 تا 1970 زۆر کەم بووە. هەر بۆیە تێکەڵاوەکانی بێنزودیازێپام کە بۆ چارەسەری ئەم جۆرە نەخۆشییانە رێگاچارەیەکی خێرا بوو، لە لایەن پزیشکەوە بە باوەشی کراوەوە وەرگیرا و لە ماوەیەکی کورت دا، ئەو دەرمانە وەك دەرمانێکی ئارامبەخشی نوێ لە لایەن پزیشکانەوە لە تەواوی وڵاتانی پێشکەوتووی جیهان بەکاریانهێنا.

## نیشانەکانی تووشبوون

تووشبوو بە بێنزودیازێپام هەمیشە خەمۆك، ماندوو، بێ هەست و تا ئەندازەیەك بێ قەرارە. سەرەڕای ئەمانە لەوانەیە کردەوەکانی خۆی بشارێتەوە. ئەگەر دەرمانی لێ کەمبکرێتەوە، هەروەك تووشبووەکانی دیکە ناراحەت، ترسنۆك و لەوانەیە هەندێك لەم دەرمانە لە کۆن و کەلێنەکانی ماڵ یا شوێنی دەوام شاردبێتەوە. سەرەڕای بەکارهێنانی حەبی خەوهێنەر، زۆرجار تووشی بێ خەوی دەبن. ئەگەر دەرمانی پێویستی خۆی لە رێگای نایاساییەوە وەدەست بێنێ لەوانەیە لەگەڵ گرفتی ماددی بەرەو روو بێت، هەر بۆیە دەست دەکاتە دزی کردن لە خزم و برادەرەکانی. بەکارهێنانی ئەم دەرمانە هۆشبەرە لە درێژ خایەن دا، تووشبوو لەگەڵ گرفتی زۆری جەستەی و دەروونی رووبەڕوو دەکات.

## گرفتەکانی وازهێنان

ئەو تووشبووانەی دەیانەوێ واز لە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە بێنن، لەگەڵ گرفتی زۆر و جۆراوجۆر بەرەوروو دەبن، لێرەدا ئاماژە بەو گرفتانە دەکەین: لەرزینی لەش و قسەی بێ‌مانا کردن، پەرێشانی، سەرگێژە، بێ خەوی، لاوازبوون لە کۆکردنەوەی هەستەکان، حاڵەتی رشانەوە، هەستکردن بە تامی ئاسن لەنێو زار، خەمۆکی، سەرئێشە، شپرزی لە بەڕێوەبردنی ئیش وکار، حەساسییەتی زۆر بە دەنگ و رووناکایی، ماندوویەتی، تاربوونی چاو، خوراندنی لەش و هەست بە سەرما کردن، ماسولکەکان هەست بە ئێش و ئازار و هێندێجار جار کوتران دەکەن، لاوازی لە قسە کردن، وەهم و خەیاڵات، ئاڵۆزی، عارەقکردن و لەهۆشچوون.

## وازهێنان

تووشبووان بە بێنزودیازپام، ئەگەر بیانەوێ واز لە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە بێنن، دەبێ کەم کەم رادەی بەکارهێنانی ئەم دەرمانە کەمبکەنەوە. رادەی کەمکردنەوەی بە بەکارهێنانی رادەی بێنزودیازپام بەستراوەتەوە. هەردوو هەفتە جارێك بکرێتە نیوە تا ئەو کاتەی کە نەتوانن لەوە زیاتر نیوەی کەن. ئەگەر شەش حەب بەکارهات دەبێ لە ماوەی چوار رۆژدا، بکرێتە پێنج و دواتر رادەی حەبی بەکارهاتوو لە رۆژدا، لە ماوەی چوار رۆژ بکرێتە چوار دانە. بەم شێوەیە لە ماوەی دوو هەفتەدا رادەی بەکارهێنانی دەبێتە نیوە.

هەروەك پێشتر سەبارەت بە تووشبوون بە ماددەکانی دیکەدا گوترا، دەرکەوتنی هۆی دەست پێ‌کردنی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان زۆر گرینگە. ئەگەر هەلومەرج و فشارەکانیتووشبوو دوای وازهێنان ئاڵوگۆری بەسەردا نەیێت، بە دوای وازهێنان زۆر بە خێرایی دەست بە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە دەکاتەوە.

## مەترسییەکانی تووشبوون

ساڵی 1968 لە گۆڤاری ((کۆمەڵی پزیشکانی ئەمریکا- American Medical Association)) ڕاپۆرتێك لەسەر هەڵسەنگاندنی حاڵی هەشت کەس لەوانە ڕۆژانە دەورووبەری 5 میلی گرام بێنزودیازێپام یان لە سێ یا چوار جار لە ڕۆژدا بەکارهێناوە، بڵاوکردەوە. نووسەرەکان لە ڕاپۆرتی خۆیاندا، ڕایانگەیاند حاڵی حەوت لەو هەشت کەسە لە کاتی بەکارهێنانی ئەم دەرمانە ئەوەندە خراپ بووە 4 کە لەتاو خەمۆکی خۆیان بەردەوام بیری خۆکوژی بە مێشکیاندا هاتووە. دوو کەس لە نەخۆشەکان خۆیان کوشتووە و دوو کەسی دیکەش لە هەوڵی خۆکوژی دان. سێ یان چوار ڕۆژ بە دوای کەمکردنەوە و ڕاگرتنی دیازێپام حاڵی پێنج کەسیان بەرەو باشی چووە. ساڵی 1972 لە گۆڤاری ((نەخۆشییە دەروونییەکانی ئەمریکا- American Journal Of Psychiatry)) ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە و بە وردی شیکردووەتەوە چۆن شەش کەس لە نەخۆشەکانی تووشبوو بە دیازێپام تووشی لەرزین، ترس، خەمۆکی و بێخەوی بوون، بە پێی ئەم ڕاپۆرتە ئەم نەخۆشانە بەر لەوەی لەگەڵ بەکارهێنانی ئەم دەرمانە ئاشنا بن، خاوەنی هەستێکی نەرم بوون. بەڵام بە دوای بەکارهێنانی ئەم دەرمانە، لە ناکاو نیشانەکان و گرفتەکانی زۆر مەترسیدار لەوان وەدەرکەوت و کاتێك وازیان لە بەکارهێنانی دیازێپام هێنا ئەم نیشانانە نەمان.

ساڵی 1979 یەکێك لە پزیشکانی نەخۆشییە دەروونییەکانی هۆڵەند لە ڕاپۆرتێکدا، لە یەکێك لە گۆڤارەکانی پزیشکی ئەم وڵاتە، شیکردەوە چۆن دڵەڕاوکێی توند و ئاڵوگۆڕی دەروونی تاقەت پڕوکێن لە چوار کەس لەو نەخۆشانەی، حەبی خەوهێنەری بێنزودیازێپامیان بەکارهێناوە. ئەم ڕاپۆرتە بوو بە هۆی شکایەتکردنی 600 کەس سەبارەت بەم دەرمانە لە لایەن کەسانی جۆراوجۆرەوە.

له کۆنفرانسی ساڵی 1982 له ((نه‌نیستیتوی نه‌ته‌وه‌یی ته‌ندروستی- National Insttute Of Health)) له شاری واشنتون پێکهات، یه‌کێك له پرۆفیسۆره‌کانی به‌شی ده‌روون ده‌رمانی له راپۆرتێکدا له وێنه‌ی مێشکی گروپێکی بچووك له‌و نه‌خۆشانه‌ی چه‌ندین ساڵه دیازپام به‌کاردێنن، راستییه‌کان ئه‌وه ده‌رده‌خه‌ن مێشکی نه‌خۆشه‌کان تووشی گرفت بووه و له کۆنفرانسی ده‌رمانناسی ده‌مار- ده‌روونی له ساڵی 1982 له شاری نورشه‌لیم پێکهات ناکامی یه‌کێك له لێکۆڵینه‌وه‌کان ئه‌وه‌ی سه‌لماند بێنزودیازپام له‌وانه‌یه شوێنه‌وارێکی زۆر له به‌شی بیرکردنه‌وه‌ی (حافظه) ئینسان دابنێ.

ئه‌و شوفێرانه‌ی پێش ده‌ستپێکردنی لێخوڕینی سه‌یاره‌کانیان، بێنزودیازپام به‌کاردێنن زۆرتر تووشی کاره‌ساتی سه‌یاره ده‌بن. هه‌روه‌ها ئه‌م تێکه‌ڵاوه ده‌رمانییه شوێنه‌وارێکی زۆر خراپ له‌سه‌ر په‌یوه‌ندی سێکسی نه‌خۆش داده‌نێ و ئه‌گه‌ر هاوکات له‌گه‌ڵ چای و قاوه به‌کاربهێنرێ هانده‌ری ده‌ستدرێژی سێکسی ده‌بێ و گرفت دروستده‌کا. ئه‌گه‌ر ژنی دووگیان به‌کاری بێنێ له وانه‌یه شوێنه‌واری خراپ له‌سه‌ر منداڵه‌که دابنێ و هه‌روه‌ها ئه‌و دایکانه‌ی منداڵه شیره‌خۆره‌یان هه‌یه ئه‌گه‌ر ئه‌م ده‌رمانه به‌کاربێنن بۆ کۆرپه‌کانیان زۆر جێگای مه‌ترسی هه‌یه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌وانه‌یه جه‌رگیان زه‌ره‌ری پێبکه‌وێت. گرفتی گه‌وره‌ی بێنزودیازپام تووشبوونه‌که‌یه‌تی، هه‌رچه‌ند شوێنه‌وار و مه‌ترسییه‌کانی تری ده‌بێته هۆی دڵه‌راوکێی زۆر له نێو پزیشکان، به‌ڵام له ساڵه‌کانی کۆتایی هه‌شتاکان، ئه‌وه‌ی وه‌ك ئه‌رکێکی سه‌ره‌کی هاته به‌رباس و یارمه‌تی به وازهێنانی میلیۆنان تووشبوو به‌م ده‌رمانه هۆشبه‌ره‌یه. ئه‌گه‌ر به‌کارهێنانی بێنزودیازپام به خێرایی راگیرێ، شوێنه‌واری لاوه‌کی، ئه‌گونجاو و مه‌ترسیداری به دواوه ده‌بێ و زۆربه‌ی پسپۆران له‌و بروایه‌ن ئه‌گه‌ر نه‌خۆشێك بیه‌وێت مه‌سره‌فی ئه‌م ده‌رمانه به‌کاربێنێ ده‌بێ رای پزیشکی تایبه‌تی له‌سه‌ر بێت.

## کانابیس

(کانابیس ساتیوا- cannabi sativa) رووەکێکە زۆر بە ئاسانی و خێرا لەتەواوی جیهاندا، دەڕوێ. ئەم رووەکە لە هەندێك لەولآتانی جیهان بەتایبەتی ئێران و ئەفغانستان بە شادانە ناسراوە. گیایەکە، زۆرتر لە گەزنە دەچێت و بەرزایەکەی دەگاتە دوومەترو گەڵاکانی درێژن. دانەیەکی هەیە بەئەندازەی فەندق، رۆنێکی بۆن ناخۆشی هەیە، رۆنەکەی دەگرن و بۆ کاری دروستکردنی سابوون کەڵکی لێ وەردەگرن. لەسەر شاخە گوڵدارەکانی ئەم گیایە بەنگ و چەرس دروستدەکەن و ناوی حەشیش بە شاخە گوڵدارو هەروەها بەو مەوادده دەگوترێ کە لە شادانە دروست دەکرێ. لەئەمریکای باشوور (ماری جوانا) ی پێ دەڵێن. کانابیس لەتەوای جیهاندا، دەڕوێ و بەم ناوانە ناسراوە: بەنگ بەنگ، چەرس، گەرس، گەنجەگوج، حەشیش، هەپ، هەرب، هەمبی هیندی، ماری جوانا، مری جین، پات رەداویل، ریفر، ئیسمش، چای ئێستیك تایلەندی و وید.

## بەرهەمەکانی کانابیس

1- **چەرس:** مادده‌یەك وەك بنێشت، هۆشبەرو سەمییە، لە رووەکی کانابیس (شادانە) دروست دەکرێ. بۆ ئەم مەبەستیش کانابیس (شادانە) لە نێو پارچەیەکی (قوماش) زبر دەگوشن تا شیلەی ئەو ماددەیە لە نێو پارچەکە دێتە دەر. ئەو شیلەیە لەدوای وشککردن چەرسی پێ دەڵێن و لەسەر قلیان و دەمنە (پیپ) دای دەنێن و دەیکێشن. ئەم ماددە هۆشبەرە لە حەشیش مەترسیدار ترە.

2- **حەشیش:** حەشیش تۆزێکە لە چەرس دروستدەکرێ و بەشێوازی جۆراو جۆر بەکاری دێنن. ئەم ماددەیە لە ماری جوانا مەترسیدارترە.

3- **ماری جوانا:** تێکەڵاوێکە لە گەڵاو پەلکە وردەکراوەکان و گوڵ و گیای کانابیس (شادانە) ئەم شێوازە لە ئەمریکای باشوور دروستدەکرێ.
4- **گراس:** لە بەرهەمەکانی گیای شادانەیە (کانابیس) هەروەك حەشیش و چەرس و بەنگ لە ڕێگای جگەرە و دەمنە دەیکێشن.
5- **بەنگ:** تۆزێکە لە تێکەڵاوی گەڵاو شاخە تازە گوڵداربووەکانی شادانە، بە هۆی ماددەیەکی سەمی کەهەیەتی وەك: تووتن لەسەر قلیان و دەمنە دەیرێژن و بەکاری دێنن.

دیارە گیراوەکەی بەنگاوی پێ دەڵێن و وەك ناو دەیخۆن و مەواددێکی لێ دروستدەکەن، لە کاری پزیشکیدا کەڵکی لێ وەردەگرن.

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، مێژووی بەرهەمهاتن و بەکارهێنانی کانابیس (شادانە) دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایین، میسرییەکان، چینییەکان، هیندییەکان و دواتر ئێرانییەکان بەکاریان هێناوە. بەڵام لە ئەوروپادا. مێژووی بەکارهێنانی کانابیس دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم. لە بەریتانیاو ئەوروپای ڕۆژئاوا بۆ وازهێنان، لە تریاك روویان لە بەکارهێنانی کانابیس کردووە. بەڵام بەوشێوەیە پێشوازی لێ نەکراوە. یەکەمین راپۆرتی زانستی لە پەیوەندی لەگەڵ کانابیس لەلایەن پزیشکە بریتانییەکان کە لە هیند و قاهیرە ئیشیان دەکرد پێشکەشکرا و گرینگترینیان راپۆرتی دکتۆر (وارناك- warnock) بەڕێوەبەری شێتخانەی قاهیرە بووە. ساڵی 1859 رایگەیاند بەکارهێنانی کانابیس دەبێتە هۆی شێتی مرۆڤ.

بیروڕای وارناك لەو سەردەمەدا، لەلایەن رای گشتییەوە وەرنەگیرا. بۆ وێنە کۆمیسیۆنی ماددە هۆشبەرەکانی هندی (Indian Hemp Drugs Comission) لە ساڵی 1983- 1984 بەمەبەستی سات و سەودای ئەم ماددەیە و شوێنەواری لەسەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی خەڵکی هیند و تبت و هەروەها پشتگیری لە چاندنی ئەم ماددەیە دامەزرا، لە کۆتایی کاری خۆیدا، رایگەیاند ئەگەر لە بەکارهێنان و مەسرەفکردنی کانابیس زیادەڕەوی نەکرێ، شوێنەواری

جەستەی، دەروونی و ئەخلاقی ئەم ماددەیە جێگای مەترسی نییە. هەروەها رایگەیاند هیچ چەشنە بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە بەکارهێنانی کانابیس مرۆڤ تووشی تووشبوون بکا و تەواوی بەڵگەکان ئەوەی دەردەخست شوێنەوار و مەترسییەکانی کانابیس زۆرتر لە چای و قاوە نییە!

بیروڕاکانی دکتۆر وارناك لە راپۆرتی کۆمیسیۆنی ناوبراو کەوتە بەرچاو، بوو بەهۆی ئەوەی لە سالّی 1925بەریتانیا و چەند ولاّتێکی دیکە بەڵێننامەی نێودەوڵەتی تریاك مۆر بکەن. ئامانجی ئەم کۆمیسیۆنە کۆنترۆڵی هەمەلایەنەی نێودەوڵەتی بۆ بازرگانی کردن بە تریاك بوو. بەلاّم لە ئاکامی فشاری ولاّتی میسر بەکارنەهێنانی کانابیس کەوتە نێو ئەم بەڵێننامەیە، لەبەر ئەوەی هێشتا لەسەر ئەو باوەڕە بوون، بەکارهێنانی بەردەوامی کانابیس دەبێتە هۆی گرفتی دەروونی. لە سالّی 1925 بەم لاوە، کانابیس لە نێو پێڕستی ماددە کۆنترۆڵ کراوەکان مایەوە و یاسادانەران و بەرپرسانی پولیس بەکارهێنەرانی کانابیسیان هەروەك قاچاخچییان سزادەدا. بۆ وێنە لە بەریتانیا یاسای بەکارهێنانی دەرمانەکانی کانابیسیان لە نێو گروپی نامفتامین (کە راهاتنی سەلمێندراوە) دانا و بڕیار درا بەکارهێنەرانی کانابیس جیا لەوەی باجێکی زۆریان لەسەرە بۆ ماوەی پێنج سالّ بەند بکرێن.

بە هۆی بەرژەوەندییە سیاسییەکان، لە شەست سالّی رابردوو بەرێوە چووە، لە ناوچەکانی دیکەی جیهاندا شوێنەواری خراپی لێ دەرکەوتوە، بۆ وێنە لە ولاّتی نیپال (باکووری هیند) هەزاران کەس لە خەڵکی گوندەکان، بەهۆی پشتگیری لە چاندن و بەکارهێنانی کانابیس تووشی گرفتی گەورە بوون. هەر بەهۆی پێکهاتنی ئەم گرفتە لە هیند، هیندییەکانی رەنجاند لەبەر ئەوەی، لە رێو رەسمە ئایینییەکانی هیندییەکان بەکارهێنانی کانابیس وەك دەرمانێکی پیرۆز دەنلرا. لە لایەکی دیکەوە، مەشروب کە زۆرتر بە هۆی هەمان بەرێوەبەرانی رۆژئاواییەوە هاتووەتە نێو هیند، بەلاّم لە لایەن خەڵکی وەکو ماددە

هۆشبەرێکی زۆر ناپەسەند ناویان دەبرد. لە ولاّتی جامایکاش زیاتر لە سەد ساڵە بەسەر مێژووی بەکارهێنانی کانابیس تێدەپەرێ و گرفتی زۆر بۆ خەڵکی دروستکراوە. هەرچەند ئەم رووەکە لە سەدەی هەژدەوە ناسراوە، بەلاّم هاتنی بۆ نێو فەرهەنگی جامایکا، دەگەرێتەوە بۆ نێوەراستی سەدەی نۆزدەیەم و لەلایەن ئەو کرێکارانە لە هیندی رۆژئاوا و هیندەوە دەهاتن. لەم سەردەمەدا، گەنجا (ناوی ناوچەیی کانابیس) وەك شلەمەنییەك، سەرچاوەیەکی بردنە سەری هێزو هەروەها ماددەیەکە بۆ بەرگریکردن لە بەرامبەر روحی((نەگریس)) بە کاری دێنن. بەکارهێنانی کانابیس هەروەك بەکارهێنانی ئەم ماددەیەیە لە ساڵەکانی 1984 لە ولاّتی هیند. هەندێك لە جامایکاییەکان بەکارهێنانی کانابیسیان لە ئەمریکا و ئینگلیزییەکان وەرگرتووە و وەکو دەرمانێك بۆ بەهێزکردنی کاری سێکسی یا بۆ وەدەستهێنانی هەوا و هەوەسی گەنجییەتی بەکاری دێنن.

کۆنترۆڵی نێودەوڵەتی کانابیس شوێنەواری خراپی لە کۆمەڵگای ئینگلیز و ئەمریکا بەدەرخست، لەبەر ئەوەی نایاسایکردنی بەکارهێنانی ئەم ماددەیە، بەشێکی زۆر لە هاولاّتیان کە ئەم یاسایەی جێبەجێکردووە، بە بەکارهێنانی کەوتوونەتە نێو یاسا شکێنەران. روون و ئاشکرایە کانابیس وەك ماددەکانی دیکە مەترسی هێنەر و کەمتر تووشبوو لەگەڵی رادێت. هەر بۆیە پەیوەندی دانی ئەم ماددەیە لەگەڵ هیرۆیین و کوکائین زۆر هەڵەیە.

## شوێنەواری کانابیس لەسەر تووشبووان

- بە دوای بەکارهێنان چاویان جوان دەبێت و پشتی چاویان دادەکەوێ و خۆمار دەبن و کاتی نەشەبوون چاویان سوور دەبێت.
- لە ژێر رەشکێنەی چاو، هاڵەیەکی زەرد پێك دێت.
- هەست بە برسییەتی و تینوویەتی دەکا و زاری وشك دەبێت.
- پێی خۆشە کاتی نەشەبوون بە تەنیا بمێنێتەوە.

- خۆشی لە ڕەنگی ڕەش و ناهەنگی غەمگین دێت و دڵی زۆر ناسك دەبێت.

- ناتوانێ بڕیاربدات و لە کارکردن و جم و جۆڵ بێزارە.

- کاتێ پرسیاری لێ دەکەن بە درەنگەوە وەڵام دەداتەوە، چونکە فرمانەکانی بەشی بیرکردنەوە، کە کاریان بەڕێکردن و وەرگرتنی پەیام یان فەرمانە دوای بەکارهێنانی ئەم ماددەیە لاواز دەبێ و دوای ماوەیەك تووشی لە بیرچوونەوە، ناراحەتی ئەعساب، توندوتیژی، بێ ئیرادەیی و ترس دەبێ. بەڵام لە کاتی نەشە بوون و بەکارهێناندا، مێشکی زۆر بە باشی ئیش دەکات و لە ئینسانێکی ئاسایی زیاتر و زووتر وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە لە بەر ئەوەی لەم کاتەدا، فرمانەکانی مێشکی لە حاڵەتی نۆرماڵ دێنە دەرو بە شێوەی ئەکتیڤ ئیش دەکەن.

- لەکاتی بەکارهێنان و نەشەبووندا، زۆرجار بە بچووکترین هێما و ئاماژە پێ دەکەنن، ئەم پێکەنینە ئاسایی نییە.

- لە کاتی نەشەبووندا، تووشی خەیاڵاتی زۆر گەورە دەبن و بیری زۆر قووڵ دەکەنەوە.

- بەکارهێنانی ئەم ماددەیە، ڕێگا خۆشکەری چوونە نێو قۆناغەکانی دیکەی تووشبوونە و مێشك بەرەو لە بەین چوون دەبات، ئێسکی لەش پووك (بەتاڵ) و شیرەی قوڵاپەکانی دەست و لاق بەگشتی ئێسکەکان وشك دەکات. بەڵام ئەم شوێنەوارە زۆرتر لە دەم و چاودا، دەردەکەوێت.

ئەو کەسانەی ئەم ماددە هۆشبەرە بەکاردێنن، لەکاتی تاقیکاری میزدا، هیچ شتێك دەرناکەوێ، لەبەر ئەوەی تەنیا لە باری دەروونییە شوێنەوار دادەنێ و تێکەڵ بە جەستەی مرۆڤ نابێ. تووشبووان هەرکات پێیان خۆش بێ نەشەبوونیان نەمێنێ، ڕۆنەکەرە دەخۆن و دێنە سەر حاڵەتی ئاسایی.

## كوكائين

یەکێکی دیکە لە ماددە هۆشبەرەکانی ئەم سەردەمە کوکائینە، ئەم ماددەیە لە داری کوك یا کوکا دروستدەکرێ و مێژووی چاندن و بەکارهێنانی داری کۆك دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدە پێش ئێستا. کۆك بەشێوەیەکی زۆر بەربلاو هەر لە کۆنەوە لە ئەمریکای باشوور بە تایبەتی ولاتانی پیرو، بۆلیڤیا و زنجیرە چیاکانی ئەندیز هەیە و لەبەر کەش و هەوای لەبار بۆ ئەم دارە، خەڵکی ئەو ناوچەیە هەر لە کۆنەوە ئەم داریان ناسیوە و گەلاکەیان بەکارهێناوە. ئەم خەڵکە لە ڕێگای جوینی گەلای کۆك بۆ کەمکردنی فشاری عەسەبی، نارامکردنی لەش لە بەرامبەر گرفتەکانی ژیان بەکاریانهێناوە. ئەوان بە سەدان ساڵ ئەم کارەیانکردووە، بەلام هەرگیز لە بەرامبەر ئەم عادەتەی خۆیان تووشی گرفت نەبوون.

ئەم شێوە بەکارهێنانەی کۆك لەسەرەتادا، تایبەت بە ئیمپراتۆرەکانی ((ئینکـا))، ڕێبەرانی ئایینی و بەرێوەبەرانی دەوڵەتی بوو، ئەوان لە ڕێگای جوین و دەمکردن وەکو چای بەکاریان دەهێنا. دواتر ئیسپانیاییەکان هاتن و ئەمریکای باشووریان داگیرکرد. ئەوکات خەڵکی ناوچەکەیان هاندا، تا زۆرتر کۆك بەرهەمبێنن، دیارە هێشتا شوێنەوار و مەترسییەکانی بە تەواوی دەرنەکەوتبوو. ئیسپانیاییەکان لە گەلای کۆك وەك پارە کەڵکیان وەردەگرت و لە جێگای مووچە بەکرێکارانی ئەو ناوچەیان دەدا و ئەو بوارەیان پێ دەدرا تا لە ڕێگای جوین بتوانن کۆك بەکاربێنن و بۆ ماوەیەك گرفتەکانی ژیان لەبیر خۆیان بەرنەوە.

گەلای کۆك لە سەدەی نۆزدەیەمدا، گەیشتە ئەورووپا، هەرچەند هەندێك لە پزیشکان لە نێو شروبە دەرمانییەکان بەکاریانهێنا، بەلام لە نێو خەڵکی بەو شێوەیە پێشوازی لێ نەکرا. یەکێك لە دانیشتووانی دوورگەی کورس لە ئەورووپا بەناوی ((ئانجلو ماریانی)) بە تێکەڵاوکردنی گەلای کۆك شەرابێکی بە هێزی بە ناوی شەرابی ماریانی دروستکرد. ئەم شەرابە پێشوازییەکی زۆری لێ کراو

تەنانەت لەلایەن دوو پاپ، چوار پاشا و کەسایەتی ناوداری فەرانسەیی وەك: ژولی ورن، ئەلێکساندر دوما و ئێمیل زولا پشتیوانی کرا. بەڵام لە گەڵای کۆك تا ساڵی 1860 کە کۆکائینی لێ دروستکرا، لە نێو خەڵکی لایەنگری نەبوو.

لە ناوەڕاستی ساڵەکانی 1880 لە بەریتانیا، گۆڤارە پزیشکییەکانی ئەم وڵاتە لە چوارچێوەی چیرۆکدا، شێوازی بەکارهێنانی کوکائین یان دەخستە بەردەمی خەڵکی. بەشێکی زۆر لە وتارەکانی پەیوەندیدار بەم مەبەستە لە گۆڤاری پزیشکی بەریتانیا (British Medical Journal) بڵاو دەبووە. ئەم وتارانە کوکائینیان وەك دەرمانێکی هۆشبەری ناوچەیی و هەروەها بۆ دەرمانی نەخۆشییەکانی شێرپەنجە، تای وێنجە، نەخۆشی دەریا لێدراوی (دەریازەدەگی) و بەهێزکردنی سێکس پێشنیار دەکرا. ئەم دەرمانە نوێیە لە گۆڤاری لانست ( The Lancet) و گۆڤاری دەرمانەکان وەکو دەرمانێکی تابۆکراو دەناسرا. هەر لەم سەردەمەدا، لە ئەمریکا زۆربەی دەرمانەکانی تابۆکراو، کە کوکائینی تێدا بووە، کەوتووەتە بەردەستی خەڵك و بە نرخێکی زۆر هەرزان و زۆر بە ئاسانی دەستیان دەکەوت. بە دەست پێکردنی سەدەی بیست، بەکارهێنانی کوکائین لەبەر چەند هۆیەك کەمکرایەوە. ئەو یاسایانەی لە پشتگیری لە فرۆشتن و بڵاوکردنەوەی دانرا بوون، لەبەر ئەوەی وەدەستهێنانی گەڵای کۆك بە زەحمەت دەست دەکەوت، ئەم ماددە هۆشبەرە نرخەکەی تا ئەندازەیەك گران کراو سەرەڕای بڵاوکردنەوەی وتاری جۆراوجۆر سەبارەت بە کوکائین، ئەم ماددەیە لە نێو خەڵکی ئاساییدا پێشوازی لێ نەکرا و زۆرتر خەڵکی خوێندەواری کۆمەڵگا بەکاریان دەهێنا.

لە سەرەتای سەدەی بیست تا کۆتایی ساڵەکانی 1960، دەوروبەری زیاتر لە پەنجا ساڵ، بەکارهێنانی کوکائین زۆرکەم بووە و تەنیا ئەو کەسانەی گەڵای سروشتی کۆکیان دەجوو، جووتیارانی خەلکی پۆلیڤیا و پێرۆ بوون. لە نێوەڕاستی سەدەی بیست، بەکارهێنانی گەڵای کۆك لە ئەمریکای باشوور پەرەیسەند و وەك

حەقدەستی کرێکاران لە شوێنە دوورکەوتوەکانی پۆلیڤیا و پیرۆ بەکاریاندەهێنا. لە ناوچەی زنجیرە چیاکانی ئەندیز گەڵای کۆك و بەکارهێنانی عادەتێك بووە کە لە نێو کۆمەڵگادا، وەرگیرا بوو و هەروەك مەشروب سەیر دەکرا. لە شارەکانی بناری کێوەکان، گەڵای کۆك وەك دەرمان بەکاردەهات و تێکەڵاوی گەڵای کۆك لەگەڵ ناوی گەرم بە ناوی چای کۆك ناوبانگی دەرکردووە و بۆ دەرمانی زۆربەی نەخۆشییەکانی جەستەی و دەروونی بە کاریاندەهێنا. ساڵی 1980 رێکخراوی تەندروستی جیهانی لە راپۆرتێکدا، ئاماژەی بە چوار میلیۆن کەس لە ئەمریکای باشوور کرد، بە بەردەوامی گەڵای کۆك بەکاردێنن. لەو راپۆرتەدا، ئاماژە بە نێوەی دانیشتوانی ئەندیز دەکا کە لە رێگای جوێن کۆك بەکاردێنن. بەکارهێنانی گەڵای کۆك لە رێگای جوینەوە مەترسییەکی ئەوتۆی نییەو تووشبوو هەست بە ئارامی، ساغ و سلامەتی دەکا و هیچ چەشنە کردارێکی ناشایستە لەخۆ نیشان نادا.

## نیشانەکانی تووشبوون

بەکارهێنەرانی کوکائین بێتاقەت و قەبز دەبن و لەوانەیە تووشی خەیاڵات و وەهم بن. ئەوان هەستدەکەن پێستی لەشیان دەخورێ. ئەوانەی کوکائین لە رێگای لووتیانەوە هەڵدەمژن، لە لووتیانەوە ئاو دێت.

تووشبووانی کوکائین، لە ژیاندا تەنیا یەك ئامانجیان هەیە و ئەویش وەدەستهێنان و بەکارهێنانی کوکائینە و تەواوی پارەی خۆیان لەم کارە سەرف دەکەن و بنەماڵەی خۆیان بەجێدێڵن و دۆستانی خۆیان لەدەستدەدەن. هەروەها، هەست و پەیوەندییەکانی کومەڵایەتی و عاتیفی خۆی لەدەست دەدا و بۆ وەدەستهێنانی کوکائین، پەنا دەباتە بەر درۆکردن، دزی و خەویان کەمدەبێتەوە و رووخساریان نارێك و پێك، پیس و ناپەسەند دەبێت.

## شوێنەواری لە درێژخایەندا

بەکارهێنانی لە درێژخایەن مرۆڤ تووشی لەرزین و خەمۆکی دەروونی دەکات. بەکارهێنانی بەردەوام لە ڕێگای لوتەوە، لووتیان تێک دەداو سییەکان برینـدار دەکا. نیشتیای خواردنیان نامێنێ و لاواز دەبن و دوای چەند ساڵ بەکارهێنان، شوێنەواری نەخۆشی و گرفتی جیددی تەندروستی لەسەر لەشیان دەردەکەوێ.

## وازهێنان

سەرەڕای ئەوەی زۆربەی بەکارهێنەرانی کوکائین، پێیان وایە بەکارهێنانی ئەم ماددەیە ڕاهاتنی بە دواوە نییە (تووشبوون)، ئەم ماددە هۆشبەرە مەترسی زۆرە و ڕاهاتنی بەدواوە دەبێ. بۆ وازهێنان دەبێ سەردانی پزیشکی تایبەتی بکرێ و پشوودان لە شوێنی زۆر ئارام و هۆکارێك دەبێت بۆ وازهێنان. دیارە هەروەك ماددەکانی دیکە لەکاتی وازهێنان دەبێ هۆیەکانی دەستپێکردنی تووشبووان بەم ماددەیە دەربکەوێ و ئەو هۆکارانە لەبەرچاو بگیرێن، تا یارمەتی بۆ وازهێنانی لە داهاتوودا بدات.

## خەشخاش

مەترسیدارترین ماددەی هۆشبەری سروشتییە، دواتر چەندین جۆر ماددەی هۆشبەری بەهێز و مەترسیداری لێ دروست دەکەن. خەشخاش لە وڵاتانی ئەفغانستان، هیند، تورکیە، چین، روسیە، میسر، مەکسیك، تایلەند، ئێران و... هتد دەچێنرێت.

خەشخاش گیایەکی لاسکە باریك و گەڵاکانی درێژ و درشتن. گوڵێکی سپی هەیە و بەرزایەکەی دەگاتە یەك مەتر و بەری ئەم ڕووەکە، وەك تۆپێك وایە، بە دوای وەرینی گەڵاکانی لەسەر لاسکەی ئەو گیایە دەردەکەوێ و چەند ناوی هەیە وەکو: گوززی خەشخاش، پۆشینە، کۆکتار و کەبسولی غوزەی خەشخاش. لە نێو ئەو

تۆپەدا، کە خانەخانەیە مەوادێکی وردی سپی تێدایە. پێستی خەشخاش بە تیغێکی تیژ چەند دانە قەڵشی لێ دەدەن، پاشان لەو قەڵشانەدا، شیلەیەکی سپی دێتەدەر، ئەم شیلەیە لە بەرامبەر هەوادا سفت و رەنگی قاوەیی دەبێت و پێی دەڵێن تریاك یا ئەفیون.

تریاك مێژوویەکی چەندین هەزار ساڵەی هەیە. یۆنانییەکان و رۆمییەکانی کۆن، بە دەرمانێکی شادی هێنەر دەیانناسی و میسرییەکانیش بۆ مەبەستی زۆر، وەك: ئارامکردنی گریانی منداڵان بەکاریانهێناوە. بەدەستپێکردنی سەدەی حەڤدەیەم تریاك لە زۆربەی شوێنەکانی ئەوروپا بڵاوبووە و ((تۆماس سیندن هام- Thomas Syndenham)) یەکێك لە دامەزرێنەرانی گرنگی پزیشکی بەریتانیا لە تریاك بۆ دەرمانی ئێش و ئازار و پشوو و خەولێ کەوتنی نەخۆشەکان پێشنیاری کرد. پزیشکەکان لەوکاتەدا، دەرمانێکی زۆریان لەبەردەستدا نەبوو، هەر بۆیە زۆر بە خۆشحاڵییەوە لە تریاك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان کەڵکیان وەرگرت و لە ماوەی زیاتر لە سەدەیەك بەکارهێنانی ئەم ماددەیە زۆر بێ سنوور و بێ بەرنامە بوو.

لە چین چاندنی خەشخاش زۆر بە خێرایی زۆری کرد و هیچ چەشنە کەمو کورتییەکان لە نەبوونی تریاك هەستی پێ نەدەکرا. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا، بەڕێوەبەرانی حکومەتی چین هەستیان بە مەترسییەکانی ئەم ماددەیە کرد و لەگەڵ بەریتانیاییەکان کە دەسەڵاتی بازرگانی ئەم ماددەیەی لە خاکی چینەوە هەبوو، دووجار بەشەڕ هات و لەو شەڕانەدا، ئەوە بەریتانیا بوو سەرکەوتنیان وەدەست هێنا. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، بازرگانی بە تریاك یاسایی کرا. سەرکەوتنەکانی بەریتانیا و یاسای ئازادکردنی بازرگانی بە تریاك، بوو بە هۆی پەیدابوونی گرفتی گەورە لە تەواوی جیهان، بۆ وێنە یاسایکردنی تریاك لە چین بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم ماددەیە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ئەمریکادا.

مورفین: یەکێك لە بەرهەمەکانی تریاکە، جەوهەری تریاکە بە کاری کیمیایی لە تریاك جیا دەکرێتەوە، لە تریاك بێ ڕەنگتر و تامی تاڵەو بەکارهێنانی عەسەبەکان بێ هەست و تووشبوو خەوی لێ دەکەوێ. هۆشبەری ئەم ماددەیە 10 بەرابەری تریاکە، لە گەرمای 230 پلەدا، دەتوێتەوە و لە کاری پزیشکیدا کەلکی زۆری لێ وەردەگرن.

28 نۆڤەمبەری 1853، ((ئەلێکساندر وود- Alexander Wood)) بۆ یەکەمجار مورفینی گیراوەی لە لەشی قیرەمێردێك تەزریق کرد. پزیشکان بۆ ئەم شێوە نوێیە و بەکارهێنانی مورفینی گیراوە، ئۆگری زۆریان هەبوو و ڕایانگەیاند ئەم شێوەیە لە شێوەکانی کۆنی بەکارهێنانی تریاك کەم مەترسیدارترە. ئەوان لە تەزریقی ماددەی نوێ، تەقلیدیان دەکرد و بەم شێوەیە گرفتێکی گەورە و بێ وێنەیان بۆ داهاتووی مرۆڤ دروستکرد.

هیرۆئین: بۆ یەکەم جار هیرۆیین لە مورفین دروستکرا. هیرۆیین 20 تا 25 بەرابەری مورفین بەهێزترە و دووبەرابەر هۆشبەرترە. تامی هەروەك تریاك تاڵە، بەڵام بەتەواوی بێ بۆنە و ڕەنگی قاوەییە و دوای شیبوونەوەی لە نێو شلەمەنی تایبەتی و وشکبوون ڕەنگی پیس دەبێ. هیرۆیین بە بەراورد لەگەڵ مۆرفین و تریاك لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، لەشی مرۆڤ لەگەڵی ڕادێت (تووشی دەبێ) و ڕۆژبەڕۆژ ڕادەی بەکارهێنانی هیرۆئین زۆرتر بکرێت. مەترسییەکانی ئەم ماددەیە لە تریاك و مورفین زۆرترە و بە پێی لێکۆڵینەوەکان لە 100 کیلو تریاك تەنیا 1 کیلۆ هیرۆیین دروست دەکرێت. بۆ یەکەمجار پزیشکان هیرۆیینیان لە جیاتی تریاك بەکارهێنا و بە ماددەیەکی بێ مەترسیان دەزانی. بەم شێوەیە نیو سەدەی تەواو لە هیرۆیین وەك دەرمانێکی دژە ئازار و کیمیایی و بێ مەترسی گوایا هۆشبەر نییە وەك ئەلتەرناتیڤی هیرۆئین) هاتە بازاڕ. ئێستا دەرکەوتووە مێتادین هەروەك هیرۆیین هۆشبەرە، بەو حاڵەش زۆر کەس بۆ چارەسەری ئێش و ئازار بەکاری دێنێ.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەکارهێنانی تریاك، مورفین و هیرۆین پەرەیسەند و ئەو هەوڵانەی بۆ پێشگیری لە بڵاوبوونەوەی ئەم سێ ماددەیە لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانکران بێ سوودبوون، دواتر لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، لە ساڵی 1925 بۆ کۆنترۆڵی ئەم مەوادە هەنگاوێکی جیددی دەستی پێکرد. بەڵام ئەم هەوڵانە زۆر لە سەرەخۆ دەچووە پێش. بەدەستپێکردنی شەڕی دووەمی جیهانی ئەم هەوڵانەش پووچەڵکرانەوە و تا ساڵەکانی 1950 ئەوکاتەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی پێکهات، دەرکەوت هیرۆین (خەسترین، بەهێزترین، و مەترسیدارترین جۆری تریاکە) دەبێ بەتەواوی یاسایەك بۆ پێشگیری لە بەرهەمهێنان و بازرگانی و بەکارهێنانی دەربکرێت.

لە ساڵەکانی 1960 بەدواوە، زۆربەی وڵاتانی تووشی قەیرانی هیرۆین بوون تەنیا پزیشکان بوون دەیانتوانی بەپێی یاسا لە چوارچێوەی کاری خۆیان هیرۆین بە نەخۆشەکانیان بدەن.

لەم سەردەمەدا، هیرۆین وەکو پارەیەکی نێونەتەوەیی بەهۆی خراپەکاران و قاچاغچییان ئەو دەست ئەو بەدەست دەکرد. لەڕێگای ئەم بازرگانییەوە چەندین میلیۆن پاوەند سەرمایە گوزاری تێدا کراوە، قازانجێکی زۆریان دەستدەکەوێ، بەرهەمەکانی تریاك لە ئەفغانستان و ناوچەی سێگۆشەی ئالتونی لەوڵاتانی تایلەند، ئبێرمە و لائوس بەرهەمدێت. تریاکی خاو لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دەکرێتە مۆرفین و لە تاقیگەکانی فەرانسە و ئیتالیا هیرۆین دروستدەکرێت و پاشان لە ڕێگای مافیاوە بۆ سەرتاسەری جیهان بەڕێ دەکرێت. ئیستا هیرۆین لە زۆربەی وڵاتانی جیهان وەك: ئوسترالیا، بێرمە، کەنەدا، ئاڵمان، هۆنگ کۆنگ، ئیتالیا، مالیزیا، سەنگافور، سوید، تایلەند، بەریتانیا، ئەمریکا، ڤیتنام، ئێران، وڵاتانی کەنداو، تورکیەو... هتد بڵاوبۆتەوە. زۆربەی تووشبوان بە هیرۆین، گەنجەکانن کە لە شارە گەورەکان ژیان دەبەنە سەر. ئەم توشبووانە لەوانەیە لە ڕێگای کێشاندا یا بە شێوەی دەرزی لێدان بەکاری بێنن، هەر دوو شێوەی جێگای مەترسی هەیە و راهاتنی بە دواوە دەبێت.

شێوازی کۆنی بەکارهێنانی هیرۆیین، دەرزی لێدانی راستەوخۆی بۆ نێو دەمارەکانی خوێن یا ژێرپێستە. بەڵام لەبەر ئەوەی تووشبووان لە شریقەی پیس کەڵك وەردەگرن زۆرجار لەکاتی دەرزی لێدانی لایەنەکانی پاراستنی تەندروستی و کەرەستەی تەزریق لەبەر چاوناگرن. هەر بۆیە بەهەردوو شێوە، تووشبووان تووشی هەوکردن دەکات. بۆ وێنە ئەو تووشبووانەی ماددەی هۆشبەر بە دەرزی لەخۆیان دەدەن، تووشی نەخۆشی (هپاتیت تیس- hepatitis) دەبن.

زۆربەی تووشبووانی هیرۆیین بۆ پێشگیری لە هەوکردن و نەخۆشی لە رێگای لووتیانەوە، هیرۆئین بەکاردێنن و پێیانوایە لەم رێگایەوە مەترسی کەمتری بە دواوە دەبێ. بەڵام دەرکەوتووە لەم شێوەیەش هەر وەکو دوو شێوەکەی دیکە جێگای مەترسی زۆری هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا جیا لە تریاك، مۆرفین و هیرۆیین ماددە هۆشبەرێکی دیکە لە مەواددی نەوتی یا دووکەڵی بەردە خەڵووز دروستدەکرێ. ئەم جۆرە مەواددە دەستکردە هەروەك مەواددی دروستکراو، لە تریاك دەچێ و بە شێوەی حەب لە رێگای خوێنەوە بەکاردێت و هۆشبەریشە. ئەم مەوادە بۆ کاری پزیشکی دروستکراوە و وەکو حەب هاتووەتە بازاڕ و لە ساڵی 1985 پۆلیسی ویلایەتی ((کالیفۆرنیا)) ی ئەمریکا لە راپۆرتێکدا هێناویەتی، یەکێك لە داڕێژەرانی ماددەی هۆشبەر دەستی کردووە بە دروستکردن و فرۆشتنی هیرونینی دەستکرد بۆ بازاڕی رەش. ئەم ماددە هۆشبەرە هەروەك هیرونینە، بەڵام هەزار بەرابەر لە هیرونین بەهێزترە!

## شوێنەواری هیرۆئین

بەکارهێنانی هیرونین مەترسی جۆراوجۆری بە دواوە دەبێت. تووشبووان ئاگایان لە خۆیان نییە و ژیانی خۆیان دەکەنە قوربانی وەدەستهێنانی ئەم ماددەیە. ئەوان لە نەخۆشییەکانی قەبزی و خەواڵوویی دەناڵێنن و کێشی لەشیان کەم و لاواز

دەبێت. ئەگەر ژنی دووگیان هیرۆیین بەکاربێنێ و رابێت، لەوانەیە ئەو منداڵە لە دوای لە دایکبوون تووشی بێهۆشبوون (تووشبوون) بێت. منداڵی تووشبوو پێستی خۆی دەخورێنێ و دەرشێتەوە و لەشی دەلەرزێ، بەدەنگی بەرز هاوار دەکا و لە ئێش و ئازار دەناڵێنێ، نیوەی ئەو منداڵانەی لە دایکی تووشبوو لەدایك دەبن بە هۆی کەسانی دیکەوە بەخێو دەکرێن. لەبەرئەوەی ئەم جۆرە دایکانە بە هیچ شێوەیەك ناتوانن بەخێویان بکەن. هەندێك لەم منداڵانە بەهۆی دایك و باوکی تووشبووی خۆیان دەکوژرێن یا لە نێو ئاو دەیانخنکێنن.

وازهێنانی هیرونین لەوانەیە، مەترسی زۆری هەبێ و تووشبوو تووشی ئیش و ئازاری زۆر بکات. تووشبوو لەکاتی وەدەست نەهێنانی هیرۆیین تەواوی شوێنەوار و نیشانەکانی نەخۆشی ئانفلولانزای لێ وەدەر دەکەوێ، وەك: لەرز، سەرگێژە، رشانەوە، ئارەق کردن، ئێشی ماسولکەکان و پەرێشانی.

## هۆیەکانی زۆربوونی تووشبووان بە هیرۆیین

1- قاچاغچی و فرۆشیارانی تایبەت بە ماددە هۆشبەرەکان، لە فێرکردنی خەڵکی بە تایبەتی لاوان زۆر سەرکەوتوون. هەرچەند بە پێچەوانەی بازرگانی تووتن و مەشروب بۆ فرۆشی بەرهەمەکانی خۆیان ناتوانن بە شێوەی ئاشکرا پروپاگەندە بکەن، بەڵام لە بەرامبەردا ترس و تۆقان بەکاردێنن. پەیوەندی گروپە نهێنییەکانی قاچاغ لە ئاستی جیهاندا، بە جۆرێك بە رێوەدەچن کە لە ئاکامدا، تووشبووان بە بڕوای ئەوەی ئەگەر رۆژێك کڕین و بەکارهێنانی هیرۆیین راگرن یا قەدەغەی بکەن چییان بەسەر دێت ترس و تۆقانیان هەیە.

2- خاڵی گرنگتر ئەوەیە ئاڵوگۆڕەکانی ئابووری و سیاسی لە وڵاتەکانی ئێران، پاکستان و ئەفغانستان بووەتە هۆی ئەوەی لە ساڵەکانی دەیەی 1980نرخی تریاك کەمبکرێتەوە. هەرچەندە نرخی تریاکی خاو هیچ کات گران نەبووە،

بەڵام هەرچی نرخی کەمتر بێت مانای ئەوەیە قازانجی دروستکردنی هیرۆیین لە تریاك زۆرتر دەبێت.

3- رادەی تووشبووان رۆژبەرۆژ بەرەو زۆربوون دەڕوا، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی پێشتر کەوتوونەتە دوای تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان، بۆ وەدەستهێنانی پارەی تایبەت بۆ کڕینی ماددەی هۆشبەر پەنا دەبەنە بەر هەموو جۆرە تاوانکارییەك. هەندێکیان دەست دەکەنە دزیکردن و لەشفرۆشی. بەڵام زۆربەیان ئاسانترین رێگا بۆ وەدەستهێنانی ماددەی هۆشبەر و پارەی پێویست دەگرنە پێش و تێکەڵی مەعامیلە و کڕین و فرۆشتنی ماددەی هۆشبەر دەبن. ئەم تووشبووانە بۆ ئەوەی خۆیان بتوانن ماددەی هۆشبەر وەدەستبێنن دەبێ خەڵکی دیکە تووشی ماددە هۆشبەرەکان بکەن و لەو رێگایەوە فرۆشی ماددەی هۆشبەر زۆرتر دەبێت و هەم ئەوان بە مەبەستی خۆیان دەگەن و هەم بازرگانان قازانجی زۆرتریان دەستدەکەوێ.

4- لەو ناوچەیە کە لەگەڵ گرفتی گەورەی بێکاری بەرەو رووە، بێتاقەتی و خەمۆکی زۆربەی لاوان هاندەدا تا بۆ رزگاری لەم ژیانە و هێنانی زەوقێکی نوێ بە ژیانی ناهۆمێدی خۆیان روو دەکەنە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی هیرۆئین. لەم سەردەمەدا، بەشێکی زۆر لە لاوان وا دەزانن بە تاقیکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان هیچ شتێك لەدەستنادەن.

## بە گشتی ئەو کەسانەی تریاك بەکاردێنن

- چاویان جوان و خومار دەبێت و هەمیشە پڕە لە ئاوو سوور هەڵدەگەڕێ.
- کاتی نەشەبوون پێیانخۆشە خۆیان بخورێنن، بە تایبەتی لووتیان و گوێچکەیان.
- بە لووتیان قسە دەکەن. رەنگی دەم و چاویان رەش هەڵدەگەڕێ و لێوەکانیان بە رەنگی قاوەیی هەڵدەگەڕێ.

- حەزیان لە چایی رەش و جگەرەە، لەبەر ئەوەی رادەی نەشەبوون دەباتە سەرێ.
- هێزی لەش کەمدەکاتەوە، شوێنەوار لەسەر فام و دەرکی مرۆڤ دادەنێ، مرۆڤ ترسنۆك باردێنێ و هەمووکاتێ گێژو بە بچووکترین شتێك تێکدەچێ.
هەروەها گەدە، میزڵدان، دڵ، گورچیلە و... هتد تووشی لاوازی دەبن.

## ئەو کەسانەی مورفین و هیروئین بەکاردێنن

- بە لووتیان قسە دەکەن، چاویان بۆ هەڵنایە و هەست بە قورسبوونی سەریان دەکەن.
- پشتی دەچەمێتەوە و لاقی دەنووشێتەوە، کاتێك بەرێگادا دەڕوا لەوانەیە بکەوێ.
- عاتیفە و موحیبەت لە وجوودی دا دەمرێ و هەستی نامێنێ.
- زۆرتر حەزدەکا بە شێوەیەك دانیشێ، لاقی لەسەر سینگی کۆبکاتەوە و سەری بەسەردا بگرێ.
- هەموو کاتێك لە ژیان بێزارە و ترسنۆکە، رەنگی دەم و چاوی زەرد و لاواز دەبێ و لەشی، بەتایبەتی دەستی دەلەرزێ.
- ئەعسابی تووشی نەخۆشی دەبێت و دەروونیان تێکدەچێ، لە قسەکردن بێزارن و قەلافەتیان هەمیشە ئالۆزە و لەشیان تووشی ئیش و ئازار دەبێت.
- کاتێك مەوادیان دەستناکەوێ لەوانەیە شێت بن و پڕ بەدەم هاوار دەکەن و تەواوی لەشیان دەلەرزێ و ئێسکەکانیان ئێش دەکات.

**تێبینی 1:**

بەکارهێنانی ئەم مەوادده لە تاقیکردنەوەی میز، پیسایی و خوێن لە تاقیگەکاندا، لە تووشبووان دەردەکەوێ.

**تێبینی2:**

تووشبووان بۆ ئەوەی لە تاقیگەکانـدا، دەرنەکـەوێ مـەوادیان بـەکارهێناوە لـە حەبی دژی منداڵ بوونی ئافرەتان کەڵك وەردەگرن. بەوجۆرە بـەر لـە تاقیکـاری دەیخۆن و پاشان روو لە تاقیگەکان دەکەن.

## L.S.D و مادده هۆشبەرە وەهمهێنەرەکانی دیکە

### نیشانەکانی تووشبوون

بەکارهێنانی ئەم جۆرە مەوادده تا ماوەیەکی دوور و درێـژ بـە دوای وازهێنـان لـە خەیاڵات و وەهمی زۆر دەناڵێنن و خەویان تێکدەچێ، لەوانەیـە تووشـی سـەرگێژە، عارەقکردن، پەرێشانی و تێکچوون بێن. سەرئێشە و لەرز لە لەشیان وەدەر دەکـەوێ. گرفتی ماددی یەکێکی دیکە لە شوێنەواری بەکاری هێنانی ئەم ماددەیە.

L.S.D کورتکراوەی لیسرجیك، ئەسـید دیئیتـل ئەمیـد 25 ( dlyserjic acid 25 diethl amid) لەوانـەی بـەناوبانگترین مـاددەی خەیاڵهێنـەر و وەهمهێنـەر بێت. بەڵام زۆربەی مادده هۆشبەرەکانی دیکە ئەم چەشـنە شـوێنەوارەیان هەیـە L.S.d لە نێو تاقیگە کیمیایەکاندا، دروستدەکرێت، بەڵام هەنـدێك لـەو مـاددە هۆشبەرە خەیاڵی و وەهمهێنەرانـە لـە نێـو سروشـتدا زۆرە وەك: مێـسکالین لـە کالتوسی بێ درك لەناوچەکانی وڵاتی مەکسیك و بەشـێك لەباشـوورو رۆژئـاوای ئەمریکا هەیە وەردەگـیرێ. پـسی لوسـی مـین، یـەکێکی تـر لـە مـادە وەهـم هێنەرەکانە، ئەم ماددەیە کاریگەریەکی تایبەتییە و لە زۆربەی وڵاتانی جیهانـدا دەچـێنرێت. ماددەیـەکی دیکـەی خـەیاڵی stp (stp serenity tranquility andpeace) یە، ئەم ماددەیە جیا لەخیاڵهێنەری، نارامکەریشە.

Dom کورتکراوەی فرمولی کیمیایی مـاددەی 2.5 ((دی منکـسیل)) ە (-dom 25dimethoy) متیـل ئامفتـامین (methl amphetamin) لـەو مـاددە وەهمهێنەرە سروشتییانەیە.

مادده L.S.D و هەموو خەیاڵهێنەرەکانی دیکـە، لـە ساڵەکانی 1960، 1670 پێشوازییەکی زۆری لێکرا، شوێنەواری و ڕەنگدانەوەی ئەم ماددەیە هەم ئەو کات و هەم ئێستا بەتەواوی دەر نەکەوتووە. بەهۆی بەکارهێنانی ئەم مـەوادده، هـەر پێنج هەستی مرۆڤ بەهێزدەبن. ڕەنگەکان ڕوونـاکتر دێنـە بەرچـاو، هەنـدێك لـە تووشبووانی ئەم مەوادده تووشـی بیرکردنـەوەی قـووڵ دەبنـەوە و خـەیاڵاتی زۆر گەورە دەکەن و وەهم دەیانگرێ، هـەر بـەو هۆیـەوە زۆرجـار کـارێکی نائاسـایی دەکەن و لەوانەیە گیانی خۆیان لەدەست بدەن[34].

## یاپا

یاپا دوایین و نوێترین مـاددەی هۆشـبەری وەهـم و خەیاڵهێنـەرە لـەم دوایانـەدا دروستکراوە. ئەم ماددەیە حەبێکی سوورە لە وڵاتی بێرمە دروسـتدەکرێت و بـە شێوەیەکی بەربڵاو لە بێرمە و تایلەندا بڵاوبووەتەوە و هەر کەس ئـەم ماددەیـە بەکار بێنێ تووشی وەهم و خەیاڵ دەبێت و بەخەیاڵی دەبێتـە پاڵـەوان و پاشـا و دەتوانێ بە ئاسماندا بفڕێ. هەر بۆیە زۆرجار ڕوو لـە شـوێنە بـەرزەکان دەکـەن و خۆیان بەردەدەنەوە، جاری واش هەیە بۆ ڕاگرتنی ئوتۆمبێل خۆیان وەبـەردەدەن، تائۆتۆمبێلەکە ڕاگرن.

لە تایلەند چەندین منداڵ بە هۆی باوکەکانیانەوە کەئـەم ماددەیـان بـەکارهێناوە سـەربڕاون. شارەزایان دەڵێن ئەم ماددەیە لە هیرۆیین و کوکائین مەترسیدارترە[35].

## قۆناغەکانی تووشبوون و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان

بە پێی لێکۆڵینەوە لە تووشبووان، بەکارهێنان و ڕاهاتن بە مـادده هۆشـبەرەکان چوار قۆناغی هەیە. هەر کام لەم چوار قۆناغـە ڕێگـا خۆشـکەری قۆنـاغی دوای خۆیەتی و زیاتر لە 80٪ی تووشبووان ئەم قۆناغانە تێپەڕ دەکەن کەمتر دیـتراوە تووشبووێك بۆ یەکەم جار لە هیرۆیینەوە تووشی مادده هۆشبەرەکان بن.

## قۆناغی یەکەم

لەم قۆناغەدا مرۆڤ لـە رووی نائاگاییـەوە و بـە هـۆی دۆسـتی خـراپ و گرفتـە تایبەتییەکانەوە (پێشتر ئاماژە بە گرفتەکان کراوە) روو لە بـەکارهێنانی مـاددە هۆشبەرە لاوازەکان دەکات: زیاتر لە90٪ی ئەو کەسانەی لەم قۆناغەدا تووشدەبن جگەرە دەکێشن و ئەم جگـەرەە وەك سـەرەتایەکە بـۆ نێـو جیهـانی تووشـبوون بەماددە هۆشبەرەکان.

مافیا و قاچاخچیانی ماددە هۆشبەرەکان بۆئەوەی قازانجی باشـیان دەسـتبکەوێ سەرەتا بازاڕی فرۆشی ماددە هۆشبەرەکان دروسـتدەکەن بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە رێگای کەسانی تایبەت بەخۆیانەوە روو دەکەنە نێـو کۆمـەڵگا و ئـەو کەسـانەی گرفتی جۆراو جۆریان هەیە دەستنیشانی دەکەن و بە نرخێکـی زۆر هـەرزان (زۆر جاریش بە بەلاش) ماددە هۆشبەریان بۆدابیندەکەن لەو پێناوەدا، بە وتنی درۆی زۆر، سەبارەت بەماددە هۆشبەرەکان مرۆڤ دێننە سەر ئەو بڕوایەی ئەو ماددەیـە بەکاربێنن. لەم قۆناغەدا، مرۆڤ هەست بەمەترسی ماددی، دەروونی و جەسـتەی ناکا. لەبەر ئەوەی ماددەی هۆشبەری بە نرخێکی زۆر هەرزان دەستکەوتووە و لە بواری دەروونی و جەستەی شەوە لەبەر ئەوەی تازە دەستی پێکردووە تا ماوەیەك ئاسەواری دەرناکـەوێ. بـەکارهێنانی مـاددە هۆشـبەری لاواز لـەم قۆناغـەدا تـا ماوەیەك توشبوو زوو نەشە دەکا و دواتر هەست دەکا بەکارهێنانی ئەم ماددەیـە وەکو جاران نەشەی ناکات. هەر بۆیە لە رووی ناچارییەوە، روو دەکاتـە مـاددەی هۆشبەری بەهێزتر. لێرەدایە پێ دەنێتە قۆناغی دووهەم.

## قۆناغی دووهەم

لەبەر ئەوەی تووشبووان وەکو جاران بە ماددەی هۆشبەرەی لاواز وەکو: حەشـیش و گراس نەشە نابێت، روو دەکاتە ماددەی بەهێزتر و بە کردەوە پـێ دەنێتـە نێـو قۆناغی دووهەم و بەکارهێنانی تریاك. لە قۆنـاغی یەکەمـدا، دەتـوانن زۆر بـە ئاسانی واز لە ماددە هۆشبەرەکان بێن، بەڵام لـەم قۆناغـەدا، وردە وردە هەسـت

پێدەکەن تووشبووە و ناتوانی وازی لێ بێنێ. لێرەدایە رێگای چوونە نێو قۆناغی سێهەم خۆشدەبێت، لەبەر ئەوەی تووشبوو بەدوای ماوەیەك لە بەکارهێنانی تریاك وەکو جاران نەشە نابێت و بۆ نەشەبوونی روو دەکاتە بەکار هێنانی ماددەی بەهێزتر. لەم قۆناغەدا، تووشبوو هەست بە گرفتی ماددە دەکات، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی لە قۆناغی یەکەمدا، ماددەی هۆشبەری بەبەلاش یا بەنرخێکی هەرزان بۆ دابین دەکردن، نرخەکە گران کردووە و تووشبوو بۆ کڕین و وەدەستهێنانی دەست بۆ هەر کار و کردەوەیەکی دزێو دەبات.

## قۆناغی سێهەم

لە قۆناغی سێهەمدا، تووشبوو دەستدەکا بە بەکارهێنانی هیرۆیین و ماددە مۆرفین دارەکان و بەرەبەرە شوێنەواری بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر لەسەر لەش و دەروونیان دەردەکەوێ وە لە کارو ژیان بێزار دەبن و مرۆڤێکی بێ هەست، بێ عاتیفە، ترسنۆك، بێ غیرەت دەبێت و زۆر جار بۆ وەدەستهێنانی ماددەی هۆشبەر روو دەکاتە ئیشی خراپ وەك:دزی، خۆفرۆشی و تەنانەت فرۆشتنی نامووسی خۆی. هەندێك لە تووشبووان لە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان سنوورێك ناناسن و بەدوای ماوەیەك ئەم قۆناغەش تێپەڕدەکەن و روو دەکەنە ماددەی بە هێزترو شێوازی نوێی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. لە قۆناغی سێهەمدا، تووشبووان زۆر بە ئاسانی لە نێو کۆمەڵدا، جیادەکرێنەوە، لەبەر ئەوەی هەم لە بواری دەروونی و هەم لە بواری جەستەوە لە مرۆڤێکی ئاسایی ناچن و هەڵسوکەوتیان تایبەتییەوە هەمووکەس دەزانی ماددەی هۆشبەریان بەکارهێناوە.

## قۆناغی چوارەم

قۆناغی چوارەم، بە قۆناغی کۆتایی ناوبانگی دەرکردووە. لەم قۆناغەدا، تووشبووان روودەکەنە بەکارهێنانی مەترسیدارترین ماددەی هۆشبەر و شێوازەکانی ئەم ماددەیە. بەکارهێنانی هیرۆیینی گیراوە و لێدانی دەرزی لە دەمارەکانی خوێن یەکێك لەمەترسیدارترین شێوەکانی بەکارهێنانی ماددەی

هۆشبەرە. بەکارهێنانی هیرۆین و کۆکائین رۆژبەرۆژ تووشبوو، بەرەو لاوازی و نەمان دەبات. سەرەڕای نەمانە تووشبوو بە هۆی بەکارهێنانی شریقەی (سورەنگ) پیس و بە کۆمەڵ (واتە چەند تووشبوو پێکەوە لەیەك شریقە کەڵك وەردەگرن) تووشی نەخۆشی دیکەش دەبن و یەکێك لەمەترسیدارترین نەخۆشی کە هەرەشە لە تووشبووان دەکا، نەخۆشی ئایدز (+HIV)ە. بەگشتی ئەم قۆناغە، بەقۆناغی کۆتایی ژیان تووشبووان ناسراوە و ئەوانەی دەگەنە ئەم قۆناغە بەشێکی زۆریان دەمرن بۆ وێنە ساڵی 2005 بە پێی ئامارێك رژێمی ئێران بڵاویکردووەتەوە پێنج هەزار کەس بە هۆی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان مردوون[36].

وازهێنان لەم ماددە هۆشبەرەکان لەم قۆناغەدا، زۆر سەخت و دژوارە، لەوانەیە کەمتر تووشبووێك بتوانێ لەو بەڵایە رزگاری بێت.

## هۆکارەکانی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان

بۆ مرۆڤ روو لە ماددە هۆشبەرەکان دەکات و بەکاری دێنن؟ هۆکارەکان چین؟ بە پێی لێکۆڵینەوە لە تووشبووان، هۆکارەکانی تووشبوون و رووکردن لە ماددە هۆشبەرەکان لە نێو کۆمەڵگاکاندا جیاوازییان هەیە و لە هەر کۆمەڵگایەك هۆکاریکی تایبەتی بووەتە هۆی تووشبوون و راهاتنی بە مادە هۆشبەرەکان. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین ئاماژە بەچەند خاڵی سەرەکی بکەین. ئەم خاڵە سەرەکیانە لە نێو کۆمەڵگاکاندا، وەکو یەك نییە.

### 1- کەسایەتی

کەسایەتی یەکێك لەو خاڵانەیە، شوێنەواری لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ دادەنێ و هەڵسوکەوت و کرداری دەبێتە سەرەتایەك تا مرۆڤ روو لە ماددە هۆشبەرەکان بکات. هەموو کەسایەتییەك وەکو یەك نییە و لەگەڵ ئەویشدا، هیچ کەسایەتییەکیش بێ کەم و کوڕی نییە.

ترسنۆکی تووڕە بوون، بڕوابەخۆنەبوون، زوو بـاوەڕکردن بـە دەوروبـەر، عەسـەبی بوونی زۆر و... هتد. لە خاڵە لاوازەکانی کەسـایەتی مرۆڤـە و شـوێنەوار لەسـەر مرۆڤ دادەنێ و دەبێتە سەرەتایەك هۆکارەکان بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان بـۆ یەکەمجار روو لەو کەسانە بکەن و درۆ و بەڵێنی نادروست پێـشنیاری بـەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانیان پێ دەکەن، دیـارە لـەم قۆناغـەدا، لەوانەیـە ئـەم ماددەیـە بەبەلاش (بێ پارە) بەوانە بدرێ تا هیچ جۆرە فشارێکی ماددی لەسەریان نەبێ.

لەوانەیە کەسێك کەسایەتییەکی لاوازی هەبووبێت و رووی لە مادده هۆشبەرەکان نەکردبێ، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە سەر ئـەوەی، ئـەو کەسـەنە کەوتووەتـە داوی ماددەهۆشبەرەکان، واتە ئەو هەل و مەرجەی بۆ تووشبووان هاتوەتە پێش بۆ ئەو نەهاتوەتە پێش. کەوابوو تەنیا بـوونی ئـەو خاڵـە لاوازانـە لـە نێـو کەسـایەتی مرۆڤدا، هۆکاری تووشبوون نییە، بەڵکو دەبێتە سەرەتایەك بـۆ دەسـتپێکردنی و چوونە نێو تووشبوون. ئەو کەسایەتییە لاوازەی تووشبووە، کەوتووەتە نێو پیلانی هۆکارەکانی مادده هۆشبەرەکان و ئەو کەسایەتییە لاوازەی تووش نەبووە مانـای ئەوەیە نەکەوتووەتە داوی ئەم بەڵایە.

## 2- فشار

بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێشوو، ئەو فـشارانەی لـە نێـو ژیـانی مرۆڤـدا هەبووە زۆر کەم بووەتەوە، بەڵام بەو مانایە نییە نێستا هیچ چەشنە فشارێك لـە ژیانی مرۆڤ دا نییە. لەم سەردەمەدا، گومان لەوەدا نییە بە بەراورد لەگەڵ بـاب و باپیرانمان کێشەمان زۆرتر بووە. ئەم کێشەیە هەر وەکو نەخۆشی پەتای سـەدەی بیستەم بووە و زۆربەی نەخۆشییەکانی سەردەم لەم کێشەیەدا، سەرچاوە دەگـرن و تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان یەکێك لـە هۆکارەکـانی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەم کێشانەی سەردەمی ژیانی مرۆڤ.

## 3- هۆیە سەرەکییەکانی پەیدابوونی کێشە

بۆ لەم رۆژگارەدا کێشەمان زۆرە و ئەو کێشەیە هەراسانمان دەکات. هـۆی بـوونی ئەم کێشەیە لەم سەردەمەدا، دەگەڕێتەوە سەر هۆیەکی سەرەکی. لەشی مرۆڤ بـۆ ژیان لە سەدەکانی رابردوو دروستکراوە و هەر لەسەر ئەو ژیانەدا راهـاتووە. لـەو رۆژگارانەدا، ئینسان لەتوانایدا هـەبوو بتـوانی کێـشەکانی چارەسـەر بکـات یـا لەبەرامبەریدا، هەڵوێست بگرێ. بۆ وێنە ئەگـەر حـەیوانێکی دڕنـدە پـەلاماری دابا، لەشی بە کـەڵك وەرگـرتن لـە کەرسـتەی راو، بەرپەرچـی ئـەو پـەلامارەی دەدایەوە. یا ئەگەر باران بارییا، خێرا دەچووە نێو ئەشکەوتێك. هەڵـسوکەوت و جموجۆڵی ئەوکات وای لە مرۆڤ کردبوو لە بەرامبەر هەموو کێشە و گرفتەکانـدا، لەشی بەهێز و توانا بێت و بتـوانی بـە کـەڵك وەرگـرتن لـەو خاڵـە بـەهێزە لـە بەرامبـەر سروشـت و کێـشەکانی خـۆی راگـرێ و بەربـەرەکانی بکـا. ئـەم تایبەتمەندییە سەرەکییانە بۆ مانەوەو ژیانکردن، لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی دیکـە دەگوازرایەوە. کەسانێك توانای هەڵاتن، بازدان، سەرکەوتن بەسەربەرزاییەکان، یا شەڕکردنیان نەبوو، بە هۆی ئاژەڵی دڕندە یا مرۆڤەوە دەکوژران.

بەداخەوە ئەم بەرپەرچدانەوە سروشتییە لەم سـەردەمەدا، بەکارنایـە و پێـچەوانە دەبنە راگرو پێشمان دەگرن. لەبەر ئەوەی ئێمە ژیانی خۆمان زۆر خێراتـر لـەوەی لەشمان بتوانێ رابێت لەگەڵی ئاڵوگۆڕی پێداوە. لەجێگای ئـەوەی ئـاژەڵی دڕنـدە وەك: پڵیـنگ، گـورگ، یـا شـێر بـەرەو رووبێـت لەوانەیـە لەگـەڵ بێکـاری، کرێچییەتی، پسوڵەی کارەبا، ئاو، تەلیفون، گرانـی و.... هتـد بـەرەو رووبێـت. هیچ کام لەم کێشە نوێیانـە بـە ئاسـانی چارەسـەر نـاکرێن و لەشـی بـە هێـز و ماسولکەی گەورە ناتوانێ وەڵامدەری هیچ کام لەم کێشانە بێت.

ئەم چەشنە ئاڵوگۆڕە لەناکاوانە لە مێـژوودا وێنـەی نـەبووە. شـێوەی بیرکردنـەوە، مۆدەکـان، ترسـەکان، هەسـتەکان و.... هتـد بـە خێرایـی گـۆڕدراون. ئـاڵوگۆڕی

بنچینەیی لە کاروباری پزیشکی، زانست، جووتیاری تاکتیکەکانی شەڕ، پیشە و بازرگانی دەنگی جیهان بە تەواوی گۆڕیوە. بەڵام لەشی مرۆڤ هەمان لەشی هەزاران ساڵ پێش ئێستایە. لەم سەردەمەدا، لەشی مرۆڤ توانای بەرپەرچدانەوە و پشتیوانی لەخۆ نییە. لەبەرامبەر کێشەکانی ئەم سەردەمەدا، وەك قورسەکانی جۆراوجۆر توانای دانی ئەو پارەیەی نییە، لەبەرامبەر هەڕەشەکانی یاسایی ناتوانی خۆی راگرێ، کاتی بێکاری یا کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رژێمی نیداری بەستراوە بە یاساو هێز یان نیازێکی زۆر سادە وەك بۆ دیتنەوەی جێگای پارککردنی سەیارەکەی لە بەرامبەر ئەم کێشانەدا، لەشی مرۆڤ هەمان لەشی سەردەمی کۆنە و هەموو بەرپەرچدانەومیەکی لە هێزو توانای لەشی کەڵك وەردەگرێ.

لە راستیدا بەرپەرچدانەوە بە شێوازی کۆن. لەم سەردەمەدا، زۆر کارانییە لەبەر ئەوەی لە بەرامبەر کێشە پێشکەوتووەکان، نەتەنیا کارانییە، بەڵکو مەترسی هێنەریشە. بۆ وێنە لە بەرامبەر گرانی و بێکاری فشاری مرۆڤ دەچێتەسەرێ و لێدانی دڵ خێراتر دەبێت. تا ئەم کێشەیە بەردەوام بێت ناراحەتییەکانی دەروونی مرۆڤ بەردەوام دەبن و لە داهاتوودا، ئەم کێشە دەروونییانەیە مرۆڤ وا لێدەکات بە شێوەیەك خۆی لەو بارودۆخە دەرباز بکات. کەسێك لەبەرامبەر کێشەکاندا خۆڕاگرتر بێت کەمتر تووشی نەخۆشی دەروونی دەبێت، بە پێچەوانە ئەو کەسانەی خۆراگر نین مەترسی تووشبوونی گرفتی دەروونییان زۆرترە.

ناکامەکانی ئەم کێشەو فشارانە، جۆراوجۆرە و لە هەندێك کەسدا گرفتی جەستەی پێکدێنێ. لەم سەردەمەدا بەڵگەیەکی زۆر هەیە دەری دەخات، پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان کێشە و فشار لەگەڵ گرفتەکانی جەستە وەك: نەخۆشییەکانی دڵ، گەدە، تەنگی هەناسە هەیە. نەخۆشییەکانی جەستە لە کێشەکان سەرچاوەدەگرن و لەم رۆژانەدا، زۆر زەق و بەرچاون و نەخۆشییە دەروونییەکانیش لەم کێشانە سەرچاوەدەگرن و بەشێکی زۆری کۆمەڵگای تووشکردووە. لە نێوان هەر گرووپێکی تەمەنی (لاو و پیر)، هەر گرووپێکی کۆمەڵگا، هەرچین و توێژ و پیشەیەك، هەروەها

رەگەز، بەرادمیەکی زۆر لە خەڵکی لە یەکێك لە گرفتەکانی پەرێشانی، دەمارگیری، بێخەوی و... هتد دەناڵێنن و ئەم کێشە دەمارگیری و دەروونییانە بە شێوەیەك مرۆڤ بەرەو تووشبوون دەبات.

جۆری مادده هۆشبەرێك مرۆڤ بەکاریدێنێ، بەستراوەتەوە بە سروشتی ژیان و هەروەها تێکەڵاوی لەگەڵ ئەو کەسانەی برادەر یا خزمن. بۆ وێنە: ئەکتەرێکی نێونەتەوەیی سینەما، لەوانەیە کوکائین بەکاربێنێ، کرێکارێك بەرەولای بیرەو جگەرە دەڕوا، ژنێکی نێومالَ لەوانەیە لە تێکەڵاوەکانی بێنزودیازێپام کەڵکوەرگرێ.

## 4- پروپاگەندەی بازرگانی

سیگار و مەشروب دوو ماددەی هۆشبەری گرنگن لە ژێر سێبەری پروپاگەندەی بازرگانی بە شێوەیەکی زۆر بەربلاو لە تەواوی جیهاندا، بەکاردێت. بە پێشك پروپاگەندەی بازرگانی بۆ ئەم دوو مادده هۆشبەرە شوێنەوارێکی زۆری لەسەر بەکارهێنانی ئەم مادد هۆشبەرانەوە لە نێو گەنجان داناوە. هەرچەندە لە وڵاتانی رۆژئاوایی سنوورێك بۆ ئەم پروپاگەندەیە دیاریکراوە، بەڵام کۆمپانیاکان دروستکەری جگەرەو مەشروب لە کەڵکوەرگرتن لە کەرەستەکانی پروپاگەندە زۆر زیرەکانە مامەڵە دەکەن. بۆ وێنە لە هەندێك لە وڵاتان پروپاگەندەی بازرگانی لە تەلەفزیون بۆ جگەرە قەدەغەیە. بەڵام زۆربەی کۆمپانیاکانی جگەرە ناوی جگەرەکانیان لە رێگای بەرێوەبەرانی یارییە وەرزشییەکان، بە شێوەیەکی زۆر بەربلاو، لەبەرچاوی گەنجان و لاوانی ئۆگری وەرزش بلاویدەکەنەوە. ئەم شێوەیە پروپاگەندەیە شوێنەواری یەکجار زۆرە و کاتێك سەرکەوتنی بەرچاوە وەدەستدێنێ کە پاڵەوانی یارییە وەرزشییەکان بە جگەرەی کۆمپانیاکان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن، رۆژنامە و گۆڤارەکان دەردەکەون.

ئەکتەرەکانی سینەما، گۆرانیبێژەکان و... هتد ئەقشێکی بەرچاویان لەم پروپاگەندە بازرگانییانە بە تایبەتی لە جگەرە و مەشروب هەیە. زۆربەی ئەم

ئەکتەر و گۆرانیبێژانە بە بەستنی بۆندێکی بازرگانی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە جگەرە و مەشروبی ئەو کۆمپانیانە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و گۆڤار و رۆژنامەکان، ئاهەنگ و رێوڕەسمەکاندا، بەکاریدێنن و شوێنەوارێکی زۆری لەسەر ئۆگرانی خۆیان بۆ بەکارهێنانی ئەو جۆرە ماددەیە هەیە. لەبەر ئەوەی ئەم کەسایەتییانە لە نێو لاوان خۆشەویستن و هەموو کردارەکانیان لە لایەن لاوانەوە لاسایی دەکرێتەوە.

## 5- پزیشك

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی زۆربوونی تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان، نەقشی پزیشکانە، هەروەك پێشتر باسکرا، مورفین لەکاری پزیشکیدا گرنگییەکی زۆری هەیە و بە سەدان دەرمانی پزیشکی لەو ماددەیە دروستکراون. پزیشکان هەندێجار لەبەر ناشارەزایی بە سەبارەت بە نەخۆشییەکان وەك چارەسەری بە نەخۆشییەکە دەدەن، دەرمانی ئارامکەر و دژی ئازار کە لە مورفین دروستکراون بە نەخۆش دەدەن و نەخۆشیش لەسەرەتادا ئەم دەرمانە بەکاردێنێ و شوێنەواری باشی لە نەهێشتنی ئازار هەیە، هەر بۆیە بەردەوام روو لە پزیشك دەکا و ئەو دەرمانە وەردەگرێت و لە ماوەیەکی کورتدا پێی رادێت و ناتوانێ بەکاری نەهێنێ.

هەندێکی دیکە لە پزیشکەکان لەبەر قازانجی ماددی خۆیان، بۆ نەهێشتنی ئێش و ئازاری نەخۆشەکانیان جۆرەکانی بێنزودیازیپام و باربی چوریتیان پێ دەدەن، دوای ماوەیەك نەخۆش تووشی ئەو ماددەیە دەبێت و ناتوانێ وازی لێ بێنێ، هەر بۆیە بە بەردەوامی سەردانی پزیشك دەکەن و بەکاری دێنن. تەنانەت هەندێکجار تووشبووان لە ماددە هۆشبەرەکان کاتێك ماددەی هۆشبەریان دەستناکەوێ روو لە نەخۆشخانە و عیادەکان دەکەن و بە ناوی پشت ئێشە، لاق ئێشە و سەرئێشە و چەندین نەخۆشی دیکە ئەو ماددەیە وەردەگرن.

## 6- مۆدە

مادده هۆشبەرەکان هەروەك جل و بەرگ و ئۆتۆمبیل، کەوتووەتە ژێر شوێنەواری مۆدە. لە ئەمریکا، کوکائین مادده هۆشبەری رۆژە و بەکاریدێنن. ئەم ماددەیە تا چەند ساڵ پێش نەناسرابوو. بەڵام ئێستا بازرگانی بەم ماددەیە سێ بەرابەری بازرگانی فیلم و مۆسیقییە. ساڵانە لەم وڵاتەدا 45 تۆن کۆکائین بەرهەمدێت و دەورووبەری 25 میلیارد دولار داهاتی هەیە[37].

بەگشتی بێنزودیازپام هەروەك ماری جوانا، مادده هۆشبەرێکی تایبەت بە چینی مامناوەندی کۆمەڵگایە. کوکائین مادده هۆشبەری چینی دەوڵەمەندە و هیرۆتین مادده هۆشبەری چینی کەم داهاتی کومەڵگایە. لە هەندێك لە ناوچەکانی جیهان کەسێك بیهەوێ لە نێو کۆمەڵدا، وەربگیرێ یا ئەندامانی گروپەکەی رایان لەسەر بێت، دەبێ بە بەردەوامی ماددەی هۆشبەر بەکاربێنێ. بۆ وێنە لە نێو گوندییەکانی ناوچەی ئەندیز جوینی گەڵای کۆك زۆرتر لە بەکارنەهێنانی باوە. لە نێوان چینی کرێکاری باکووری بەریتانیا کەسێك مەشروب نەخواتەوە، وەك ژنێکی بەدرەوشت سەیر دەکرێ.

کارەسات ئەوەیە، لاوێك هیرۆیین بەکارنایێنێ، کاتێك تەواوی برادەرەکانی هیرۆئین دەکێشن هەست بە تەنیایی دەکات. ئەو کەسەی تەواوی هاوپۆلەکانی جگەرە دەکێشن، بەڵام خۆی جگەرەی نییە هەست بە کەموکوری دەکات. خوێندکارێکی زانکۆ کاتێك لەبەشە ناوخۆییەکان دەبینێ ئەوانی دیکە جگەرەدەکێشن بۆ هاورەنگبوون لەگەڵ ئەوانی دیکە لەوانەیە جگەرە بەکاربێنێ.

بەداخەوە لەم سەردەمەدا، رۆژ نییە مادده هۆشبەرێکی نوێ لە نێو تاقیگاکاندا دروست نەکرێت و رەوانەی بازار نەکرێت و نەبێتە مۆدەی رۆژ. ئەم مادده نوێیانە لە ماددەکانی دیکە زۆر بەهێزترن و مەترسییان یەکجار زۆرترە و خێراتر لە جاران تووشبوو بەرەو نەمان و مردن دەبات.

## 7- سێکس

جێگای هیچ شك و گومانێك نییە تەواوی مادده هۆشبەرەکان لە سەرەتادا بۆ بەهێزکردنی کاری سێکسی بە کەڵك نەناسرابێ. هەر بەم بۆنەوە بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکان بۆ بەهێزکردنی کاری سێکسی روو لە بەکارهێنانی ئەم ماددەیە دەکەن. زۆربەی ئەو کەسانەش لە بواری سێکسەوە لاوازن بەرێنوێنی کەسانی دیکەوە روو لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان بە تایبەتی مەشروب، حەشیش، تریاك و هیروئین دەکەن.

تەواوی ئەم مادده هۆشبەرانە لە کورتخایەندا، کاری سێکس بەهێز دەکەن، بەڵام لە درێژخایەندا شوێنەواری بە پێچەوانەوە دەبێت و کاری سێکس لاواز دەکات و ئەو کەسانەی بە بەردەوامی ماددەی هۆشبەر بەکاردێنن (تووشبوون) بە تەواوی لە بواری سێکسەوە پەکیان دەکەوێت و هیچ چەشنە هەستێکیان بۆ ئەم کارەدا، نامێنێ. ئەم مەسەلەیە هەم بۆ پیاوان و هەم بۆ ژنان مەترسی هەیە.

## رێگا چارەکان

تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان، گرفتێکی کۆمەلایەتی و چۆنیەتی بەرەو روو بوون لەگەڵ ئەم گرفتە، تەنیا تووشبووان ناگرێتەوە. بەداخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەوەندە تووشبووان دەکەونە بەر سزا و هەڵسوکەوتی خراپ، قاچاغچییانی ئەم بەڵایە ئەو سزایانەی وەبەر ناکەوێ.

کاتێك نەخۆشییەك لە کۆمەڵگایەکدا بڵاو دەبێتەوە، تەواوی هێز و توانای ئەو کۆمەڵگایە بۆ بەربەرەکانی و چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە دەکەوێتە کارو بەهانای نەخۆشەکان دەروون و تا ئەو جێگایە دەرفەت هەبێ و بتوانن لە بواری تەندروستییەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکە هەوڵدەدەن و لەگەڵ ئەوەیش بۆ بنەبڕکردنی ئەو ڤایرۆسە کە لەو ناوچە بڵاوبووەتەوە هەوڵ و کوششێکی

سەرتاسەری دەدرێ. بۆ وێنە نەخۆشی ئەنفولانزای باڵندە ساڵی 2005- 2006 لە هەندێك لە وڵاتانی جیهان بڵاو بووە. لە بەرامبەر ئەم نەخۆشییەدا، بنکە تەندروستییەکان بە پشتیوانی ماددی دەوڵەت بە شێوەیەکی زۆر پان و بەرین جووڵانەوە و تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتنیان وەدەستهێناو ئەوانەش گومانی ئەو نەخۆشییانەیان لەسەر بوو، کەوتنە ژێر چاودێری تەندروستی. لە کوردستانی خۆشماندا، گومانی بوونی ئەم ڤایرۆسە لە دوو ناوچەی کوردستاندا، دەرکەوت و بە میلیۆنان دولار بۆ پێشگیری لەو نەخۆشییە سەرف کراو بە میلیون مریشك و باڵندەی هاوڵاتییان بۆ بڵاونەبوونەوەی ئەم نەخۆشیە لەبەین بران.

نەخۆشی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان، نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتییە و مەترسییەکانی زۆر لە نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە مەترسیدارترە و دەبێ بۆ رزگاری بوون لەو نەخۆشییە، بە شێوەیەکی گشتی هەوڵ بدەین و دانانی سزا بۆ تووشبووان زۆر هەڵەیە، تووشبوو هەروەك نەخۆشەکانی دیکە پێویستی بە یارمەتی پزیشکی و دەروونی هەیە تا لەو بەڵایە، رزگاری بێت. بەداخەوە لە نێو کۆمەڵگای ئێمەدا وەکو تاوانبارێك چاو لە تووشبووان دەکرێت، ئەوە لە کاتێك دایە تووشبوو نەخۆشە و پێویستی بە چاودێری پزیشکی و یارمەتی ئێمە هەیە. ڤایرۆسەکەش ئەو کەسانەن ئەم بەڵایە لە نێو کۆمەڵگادا بڵاو دەکەنەوە و هاووڵاتییان فێری بەکارهێنان و تووشبوون بەم ماددەیە دەکەن. بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی ئەم نەخۆشییە دەبێ ئەو کەسانەی بازرگانی بەم ماددەیە دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە سزابدرێن و بە کۆمەڵگا بناسرێن.

## لە بەرامبەر تووشبوواندا، ئەرکی ئێمە دەبێ یارمەتی ئەو کەسانە بێت و چۆنیەتی یارمەتییەکەش بەم شێوەیە دەبێت:

1- تا ئەو کاتەی تووشبوو هەست بەو کێشەو نەخۆشییە نەکات و بۆ رزگاربوون لەو بەڵایە داوای یارمەتی نەکردووە، ناکرێ یارمەتی بدەین.

2- هەرگیز یارمەتی تووشبوویێك مەدەن، تانەو کاتەی داوای یارمەتی لە ئێوە نەکردبێ لەبەر ئەوەی ئەم کارە تەنیا کێشەکە درێژخایەن دەکات و هەوڵمەدەن دەست لە ئیشەکانیان وەربدەن.

3- بوار مەدەن کێشەکانی تووشبووان، شوێنەوار لەسەر ژیانی ئێوەدا بنێت. ئیشی خۆتان یا برادەرەکانتان بۆ یارەمەتی دانی تووشبووان لەدەست مەدەن.

4- ئەگەر هەرمشەتان لەتووشبووان کرد، رای خۆتان مەگۆڕن. تووشبوو خاوەنی ئیرادەیەکی لاوازە و ئەوە ماددەی هۆشبەرە بەرێوەی دەبات. کەوابوو لە بەرامبەریدا، دەبێ بەهێز و لەسەر بڕیارەکانمان سوور بین و دڵمان بۆی نەسووتێ.

5- تا ئەو جێگایە دەتوانن پشتگیری بکەن و هانی بدەن و موجیبەتی پێ بکەن. تێ بکۆشن بە هێنانەوە بیری باوەڕەکانی، هێزو ئیرادەی بە هێز بکەن تا زۆرتر بڕوای بە خۆی هەبێت.

6- هەرگیز بیانووی پێ مەگرن، هێزی خۆتان بۆ لەناو بردنی ئەو خاڵانەی تووشبوو دەیان شارێتەوە بەکار مەهێنن. لەبەر ئەوەی ئەم کارە سەرکەوتوو نابێت و زیان لە پەیوەندی خۆتان و تووشبووان دەدەن.

7- یارمەتی تووشبوو بدەن، بە شێوەیەك لەوازهێنانیدا، بڕوای بە خۆی هەبێت و لە هێزی خۆی کەڵك وەرگرێت.

8- تووشبوو لە سەرەتای وازهێنانا، دەبێ لەیارمەتییەکانی پزیشك بێ بەش نەکرێت.

9- هەرگیز ئەوەی، بەڕای ئێوە رێگا چارەیەکی بێ مەترسییە، بەتووشبوو پێشنیار مەکەن لەبەر ئەوەی هەوڵ و کۆششی زۆر کەس لە پەیوەندییەدا، بووەتە هۆی دروستبوونی کێشەیەکی دیکە.

10- ناو و شوێنی تەواوی ئەو گرووپ و رێکخراوە ناوچەییانەی لەوانەیە بتوانن یارمەتی بە تووشبوو بدەن بەلاتانەوە بێت.

لەبیرتان نەچی ئەنێوە و ئەکەسی دیکە ناتوانێ یارمەتی تووشبوو بدەن، تا ئەوکاتەی تووشبوو بڕوای بە کێشە و گرفتی خۆی هێنابێت.

## وازهێنان

1- بەپێی پێناسەی تووشبوون، کەسێك واز لە تووشبوونەکەی دێنێ، دەبێ ماوەی وازهێنان تێپەڕ بکات. لەوانەیە ئەم ماوەیە ناخۆش و بە ئێش و ئازار بێت.

2- ماوەی تێپەڕکردنی ئەم وازهێنانە بەستراوەتەوە بەساغ و سەلامەتی و هێزی تووشبووان و ماوەی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و ڕادەی بەکارهێنانی.

3- شوێنەواری وازهێنانی ماددەیەکی هۆشبەر لە تووشبووان جیاوازی هەیە. تووشبووێك لەوانەیە بتوانێ ماددە هۆشبەرێك بە شوێنەواری کەمتر تەرك بکات و بە پێچەوانە لەوانەیە تووشبووێکی دیکە بە ئێش و ئازارێکی زۆرتر واز لە ماددەی هۆشبەر بێنێ.

4- بە هۆی ئێش و ئازارەکانی وازهێنان، تووشبووان دەبێ ماوەی وازهێنان لە شوێنێکی بێدەنگ و هێدی هەڵبژێرن. فشارەکان و کێشەکانی دەورووبەر دەبێ بە تەواوی کەمبکرێتەوە.

5- پێش دەستپێکردنی وازهێنان، تووشبوو دەبێ لە ڕێنوێنییەکانی پزیشکی پسپۆڕ کەڵك وەرگرێت. هەندێك لە ماددە هۆشبەرەکان، وەك: باربی چوریت و بێنزودیازپام دەبێ بۆ وازهێنان، ڕادەی بەکارهێنانی ئەم ماددمیە ڕۆژبەڕۆژ کەمتر بکرێتەوە.

6- هیچ تووشبووێك نابێ بەتەنیایی ماوەی وازهێنان دەستپێبکا. لەبەر ئەوە تووشبوو لە کاتی وازهێنان پێویستی بە پشتیوانی، هاندان و چاودێری دەورووبەری هەیە.

7- لەکاتی تێپەڕاندنی ماوەی وازهێنان، لەوانەیە تووشبوو لە بواری دەروونییەوە تووشی تێکچوون و لاوازی بێت، ئەم قۆناغە، کاتییە و دەبێ چاوەڕوانی بێت.

8- هەر چەشنە نیشانەیەکی نائاسایی یا مەترسیدار لە ماوەی وازهێنان دەبێ لە خێراترین کات لەگەڵ پزیشکی تایبەتی باس بکرێت.

9- له هەندێك شوێن پزیشکان بۆ یارمەتی بە تووشبووان، خەستەخانە یا نیمکاناتی تایبەتی لەبەر دەستیانندایە، لەم کاتەدا، دەبێ لەم نیمکاناتە کەڵکوەرگرین. بەو حاڵەش لە زۆربەی شوێنەکان تووشبووان ماوەی وازهێنان لە ماڵەوە تێپەڕ دەکەن.

10- ئەو تووشبووانەی ماوەی وازهێنان تێپەڕدەکەن دەبێ بە ئەندازەی پێویست خواردن و ئاو بخۆن.

11- ئەگەر هەوڵەکان، بۆ وازهێنانی تووشبوو و گۆڕینی ئەو هەلومەرجەی تووشبووی تێدایە، سەرکەوتو نەبوو، لەم کاتەدا، تەنیا کاتی خۆمان بە فیڕۆ دەدەین.

## ڕێکخراوە پەیوەندیدارەکانی مادده هۆشبەرەکان لە ڕابردوو تا ئێستا[38]

یەکەمین ڕێکخراوی جیهانی لە پەیوەندی لەگەڵ کۆنترۆڵی مادده هۆشبەرەکان ((کۆمیسیۆنی نێو دەوڵەتی تریاك)) بوو. ئەم ڕێکخراوەیە ساڵی 1909 لە شاری شانگهای چین دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە لە نوێنەری سێزدە وڵات پێکهاتبوو. گوڕینەوەی راو بۆچوونەکانیان بوو بە هۆی پێك هاتنی یەکەمین بەڵێن نامەی کۆنترۆڵی مادده هۆشبەرەکان لە ساڵی 1912 لە شاری لاهای هوڵەندا و بە بەڵێننامەی نێودەوڵەتی 1912 ی تریاك ناوبانگی دەرکردووە. ئەم بەڵێن نامەیە بۆ یەکەمجار هاوکاری نێودەوڵەتی بۆ کۆنترۆڵی مادده هۆشبەرەکانی لە چوارچێوەی یاسایی پێك هێنا.

بەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی کۆمەڵەی گەلان لە سەرەتای دامەزرانیدا، کۆمیتەی گۆڕینەوەی راو بۆچوون، سەبارەت بە تریاکی پێکهێنا و لە کۆبوونەوەی ساڵی 1925 کە لە ژنێڤ پێکهات لە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلاندا بەشێکی دیکە لە یاساکانی نێودەوڵەتی باسکران. ئەم یاسادانانە نێودەوڵەتییە، ئاڵوگۆڕێکی بە دواوە بوو، بە پێی ئەم ئاڵوگۆڕانە یاسا لە بواری

کردەوە، زۆرتر بواری پێدراوە و لە هەوڵەکانی پێشووی بۆ کۆنترۆڵی تریاك پێکهاتبوون زۆر بەهێزتر بوون. گرنگترین لایەنی بەڵێننامەی 1925 ئەوە بوو، سەرەڕای تریاك، کۆنترۆڵی بەکارهێنانی کانابیس ـ یش کەوتە نێو بەڵێننامەکە و وەك ماددە هۆشبەری مەترسیدار ناونرا. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، کانابیس لەبەر راگرتنی دڵی میسرییەکان بۆ نێو ئەم بەڵێننامەیە هاتووە، لەبەر ئەوەی هیچ چەشنە بەڵگەیەك لە بەردەستدا نەبوو دەربخات ئەم ماددەیە زۆر مەترسیدار بێت. بە دوای رێکەوتنی 1925، کونفرانس و کۆر و کۆبوونەوەی زۆر پێکهاتووە و رێکەوتن و بەڵێننامەیەکی زۆر مۆرکراوە. ساڵی 1931 بەڵێن نامەیەك مۆرکرا، ئاکامی ئەم رێکەوتنە کەمکردنەوەی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی دەرمانە خەوهێنەرەکانی بە دواوە بووە. ساڵی 1936 چوارەمین بەڵێننامەی نێو دەوڵەتی بە مەبەستی پێشگیری لە هێنان و بەرێکردنی دەرمانە نایاساییەکان وەك تاوانێکی نێودەوڵەتی مۆرکرا.

## ئاڵوگۆڕەکان بە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی

شەڕی دووهەمی جیهانی زۆربەی ئەو سەرکەوتنانەی لە نێوان ساڵانی 1920 تا 1930 وەدەست هاتبوون پووچەڵکردەوە، بەڵام لەو رۆژە بەدواوە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوی تەندروستی جیهانی کۆنترۆڵی نێو دەوڵەتی ماددە هۆشبەرەکانی وەئەستۆ گرت و زۆربەی ئەو ئەرکانەی لەلایەن کۆمەڵەی گەلان بەرێوە دەچوون، درانە نەتەوە یەکگرتووەکان. ساڵی 1940 ئاڵوگۆڕێکی زۆر و بەکردەوە دژی ماددە هۆشبەرەکان بەرێوە چووە. بۆ وێنە: پێش شەڕی دووهەمی جیهانی تەنیا ئەو ماددە هۆشبەرانەی لە سێ رووەکی خەشخاش، کوك و کانابیس دروست دەکران، کەوتبوونە بەر کۆنترۆڵ ، بەڵام ساڵی 1948، یاسا ژمارەیەکی زۆر لە ماددە دەستکردەکانی خستە نێو کۆنترۆڵی راستەوخۆ. ساڵی 1971 بەڵێن نامەیەکی دیکە لە پەیوەندی لەگەڵ دەرمانی دەروون، کۆنترۆڵی نێودەوڵەتی ماددە هۆشبەرەکان، ماددە وەهم هێنەرەکانی وەك: L. S. D، ماددە

ئارامکەرەکان، خەوهێنەرەکان وەك: تێکەڵاوەکانی باربی چوریت و ئامفتامینی هێنایە نێو کۆنترۆڵ و چوارچێوەیەکی دیاری کراوی بۆ دانا.

## ڕێکخراوەکانی کۆنترۆڵی ماددە هۆشبەرەکان

1- شورای ئابووری و کۆمەڵایەتی بەرپرسی ئامادەکردنی سیاسەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێکخستن لە کۆنترۆڵی ماددەی هۆشبەر، چاودێری بەسەر بەڵێن نامەکانی نێودەوڵەتی و دانی پێشنیاری پێویست بۆ هەرکام لە وڵاتەکان.

2- کۆمیسیۆنی ماددەی هۆشبەر، بەرپرسی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی ئەو ئاڵوگۆڕانەیە کە دەبێ لە ڕێکخراوەکانی جیهانی بۆ زۆربوونی هێزی زۆرتر و کۆنترۆڵی بەکاری ماددە هۆشبەرەکان و ئەو ماددەیە بۆ دەرمانی نەخۆشییە دەروونییەکان لە ئاستی جیهاندا پێکبێت.

3- دەستەی نێودەوڵەتی کۆنترۆڵی ماددەی هۆشبەر، بەرپرسی یارمەتی بە دەوڵەتەکان، لە کەمکردنەوەی چاندن و بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکانە و چاودێری پێویست دەکات تا بەکارهێنانی ئەو ماددەیە لە لایەن ڕێکەوتنە نێو دەوڵەتییەکان خراوەتە نێو پێڕستی کۆنترۆڵ، بۆ کاری پزیشکی و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا بەرهەمبێت. یەکێك لە ڕێگاکانی بەڕێوەبردنی ئەم کارە هاوکاری دەوڵەتەکان و دانی ئاماری پەیوەندی دار بەم کارەیە.

## مافی مرۆڤ و تووشبووان[39]

تووشبوون راهاتنێکی جەستەی و دەروونی مرۆڤ بە ماددەی هۆشبەرەو وازهێنانی بۆ مرۆڤی تووشبوو زۆر سەخت و دژوار دەبێت. پێویستە بڵێین بە بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر بە هەستێکی خۆش دەگات و لەشی بەهۆی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر بەهێز دەبێت و هەستەکانی رابردووی نامێنن. بۆ پێکهێنانی هەستەکان و دروستبوونی خۆشی، پێویستە مرۆڤی دواکەوتوو، وردە

ورده رادەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان زۆرتر بکات. بە پێی بـەکارهێنانی بەردەوام، جۆرێك راهاتنی جەستەی و دەروونـی پێکـدێت. بـە شـێوەیەك بـواری وازهێنان بۆ مرۆڤـ کە وەکو تووشبووی لێهاتووە، دژوار دەبێت. ئەو کەسەی بـەم قۆناغە دەگات تووشبوو بە ماددەی هۆشبەرە.

لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوەی تووشبوون جۆرێك نەخۆشییە یا نە، باسـێکی زانسـتی زۆر لە ئارادایە و راوبۆچوونەکان دەڵێن تووشبوون جورێك نەخۆشییەو دەگـوترێ، بە ئاماژە بە ناکامی وەدەستهاتوو لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەکان، تووشبوون بە شێوەی گشتی و ئاشـکرا لـە شـوێنەواری چـالاکی مێـشك پێکـدێت. کـەوابوو دەتوانین بڵێین تووشبوون جورێـك نەخۆشـی مێـشکییە. بـەڵام دروسـتتر ئەوەیـە تووشبوو بە نەخۆش ناوبەرین نە تووشبوون. بە بڕوایەکی هەڵە مرۆڤـ بـە هـۆی ناراحەتییەك کە هەیەتی، بۆ دوورکردنەوەی ئەو کێـشە جەسـتەی و دەروونییـەی خۆی، روو دەکاتـە بـەکارهێنانی مـاددەی هۆشـبەر پێیوایـە بـەکارهێنانی ئـەم مەوادده دەبێتە هۆی پێك هاتنی خۆشی و ئەشەبوون. لە سـەرەتای بـەکارهێنان بەو ئامانجە دەگات، بەڵام لە درێژخایەندا، لەگەڵ راهاتنێکی جەستەی و دەروونی بەرەو روو دەبێت و وەك تووشبووی ماددەی هۆشبەر دەناسرێ.

هەر بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم مرۆڤە نەخۆشەو بە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان تووشبوونی بەسەردا سەپاوە. ئەم جۆرە مرۆڤە کە تووشی لاوازی دەبێت لە لایەن کۆمـەڵگاوە وەك: کـارێکی ناپەسـەند، رێگایـەکی خـراپ و تاوانبـار تووشـبوو دەکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە و تەنیا لە چەند وڵاتێکدا وەك ئیشێکی ئاسـایی چـاو لەتووشبوو دەکەن. پێویستە مافێك تووشبوو وەك مرۆڤـ هەیەتی شی بکەینەوە. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا مافی تووشـبووان لـە ((کونوانسـیون)) (Convention) واتە لە رێکەوتنی ساڵی 1988ی رێکخراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـۆ خـەبات دژی قاچاغی مادده هۆشبەرەکان و مادده وەهمهێنەرەکان شی دەکەینەوە.

## وەزعی مافی تووشبووان لە کونوانسیونی 1988

لە نێوان کونوانسیونەکانی (رێکەوتنەکان) رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (پێشتریش کۆمەڵەی گەلان)، کونوانسیونی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ خەبات دژی قاچاغی مادده هۆشبەر و وەهمهێنەرەکان لە ساڵی 1988ی وییەن (پایتەختی نۆتریش)، یەکەمین کونوانسیونێکە بە مافی ئینسانی تووشبوو بە شێوەیەکی تایبەتی ئاماژە دەکات. ئەم کونوانسیونە سەرەڕای ئەوەی ئامانجی نەهێشتنی ماددەی هۆشبەر لە جیهاندایە مافی ئینسانی تووشبووانی لەبیر نەچووە.

لە خاڵی 2ی ماددەی 14ی ئەم کونوانسیونەدا، بەراشکاوی نیگەرانی خۆی سەبارەت بە مافی ئینسانی تووشبوو دەبڕیوەو بەپێی بڕیارەکانی، هەرکام لە ئەندامان لەسەریانە بۆ پشتگیری لە چاندنی نایاسایی و لەبەین بردنی رووەکە هۆشبەرەکان وەك: خەشخاش، کوکا و شادانە (کانابیس) کە بە شێوەیەکی نایاسایی لەو وڵاتانەدا دەچێنرێ هەنگاو هەڵگرن. لەم ماددەیەدا رێز بۆ مافی ئینسانی دانراوە. سەرەڕای ئەمانە، کونوانسیونی 1988 ئاماژەی بە ناسینی تووشبوو وەك تاوانبار نەکردووە و لە ماددەی 3 (بەشی کۆتایی خاڵی 3، بەشی ج) تەنیا لە تاوانباری ئەو کەسانە دەدوێ بە شێوەی نایاسایی ماددەی هۆشبەر بەکاردێنن. ئەمە دەردەخات کاتێك بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر بە عیلاجی پزیشکەوە بەکارهاتبێ تاوان نییە.

## وەزعی مافی مرۆڤی تووشبووان لە جیهاندا

لە زۆربەی وڵاتانی جیهان تووشبووان بە مادده هۆشبەرەکان لە زۆربەی مافە کۆمەڵایەتییەکان دا بێبەش دەکرێن و وەك تاوانبار چاویان لێ دەکرێت.

له ئێراندا، تووشبوون تاوانە، بەڵام بەتەواوی تووشبووان مەجال دەدرێ رووبکەنە ناوەندی تایبەتییەکانی وەزارەتی تەندروستی، تا بۆ وازهێنان بکەونە ژێر چاودێریدا. هاوکات لەگەڵ ئەمانە تووشبوو لە ئێراندا ناتوانێ لە ئیدارەکان تەعین بێت و ئەوانەش ئیش و کاریان هەیە ئەو ئیش و کارەیان لێ وەردەگیرێتەوە. تووشبووێك ئەیهەوێ واز لە ماددە هۆشبەرەکان بێنێ، بە پێی یاسا سزادەدرێ، سزاکەشی یا سزای ماددی دەکرێ یا بە لێدانی شەلاق سزادەدرێت. ئەوە لە کاتێکدایە تووشبوو وەك ئەخۆش دەبێ سەیر بکرێ و نابێ بدرێ و ئەم سزادانە پێشلکردنی مافی مرۆڤ لەسەر تووشبووانە.

له ئەمریکا رەوشەکە تا رادەیەك هەروەکو ئێرانە. بە پێی یاسای پشتیوانی لە کەسانی پەك کەوتوو (Disabilities Act)، کەسانی تووشبوو بە ماددە هۆشبەرەکان راستەوخۆ لە پشتیوانی یاسا بێبەش دەبن. ئەم یاسایە بە بەشی دەوڵەتی و نادەوڵەتییەکان ئیجازە دەدا، لە دامەزراندن و دانی خزمەتی گشتی بۆ توشبووان خۆیان بپارێزن. ئامانجی کۆنگرە لەم یاسایە ئەوەیە تا پشتیوانی لە تووشبووان نەکرێت. لە ئەمریکا کەسێك ماددەی هۆشبەر بەکاردێنێ دەبێ بزانێ پیشە، ماڵ و بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لەدەست دەدا. بەڵام بەدوای وازهێنان دیسان لەو مافە کۆمەڵایەتییانە کەڵکوەردەگرێ.

تا سەرەتاکانی دەیەی 1960، ماددە هۆشبەرەکان له بەریتانیا، وەکو گرفتێکی گەورە سەیر نەدەکرا و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و تووشبووان وەك ئەخۆشانێك ناو دەبران کە پێویستیان بە چارەسەرکردن و چاودێری هەیە. بەڵام لە کۆتایی دەیەی 1960 بەدواوە سیاسەتی بەریتانیا لە بەرامبەر ماددە هۆشبەرەکان لەژێر شوێنەواری سیاسەتی ئەمریکا ئاڵوگۆڕی بەسەر ئەم سیاسەتە هێنا و کۆمەڵگا بە هۆی مردنی منداڵان بەهۆی مەسرەفی زۆر و لە رادەبەدەری تریاك وەك شەربەتێکی دژە ئێش و ئازار شەرمەزار بوو. بەو حاڵەش لە بەریتانیا پزیشکان دەتوانن بۆ تووشبووان، ماددە هۆشبەری پێویستیان بۆ بنووسن.

## مافی تووشبووان

به پێی یاسا، له زۆربه‌ی وڵاتانی جیهـان تووشـبووان مافیـان پێـشێلده‌کرێ و لـه زۆربه‌ی مافی ئینسانییه‌کانیان بێبه‌شده‌کرێن. له ئێران بـه پێـی یاسـا تووشـبوو مافی پێکهێنانی ژیانی هاوبه‌شی نییه و بۆ پێکهێنـانی ژیـانی هاوبـه‌ش ده‌بـێ به‌ڵگه‌نامه‌ی تاقیکاری مادده هۆشبه‌ره‌کان له یه‌کێك له بنکـه ته‌ندروسـتییه‌کان وه‌رگرن. به پێی یاسا له ئێراندا تووشبوو ناتوانێ خه‌رجی بژێوی خێزانی وه‌ده‌ست بێنێ و له په‌روه‌رده‌کردنی منداڵه‌کانی نه‌قشی نابێت.

به پێی مادده‌ی 4 و 8ی خه‌بات دژی مادده هۆشبه‌ره‌کان، تووشبوو یه‌ك تا پێنج میلیۆن ریال غرامه ده‌کرێ و تا سـی لێـدانی شه‌لاقیـشی وێ ده‌کـه‌وێ. ئه‌گـه‌ر دووپات بووه هه‌ر جارێك 74 لێدانی شه‌لاقی به‌نه‌سیب ده‌بێت. به‌راسـتی لێـدانی شـه‌لاق بـۆ که‌سـێکی نـه‌خۆش بـه پێـچه‌وانه‌ی مـافی مرۆڤـ و دژی هـه‌موو کرده‌وه‌یه‌کی ئینسانییه.

یه‌کێك له گه‌وره‌ترین مافی تووشبووان که ده‌بێ ره‌چاو بکرێ و تووشبوو بێ به‌ش نه‌بێت مافی ده‌رمانی تووشبووانه. هـه‌روه‌ك پێـشتر ئامـاژه‌ی پێکـرا تووشـبوو نه‌خۆشه و هه‌روه‌ك هه‌موو نه‌خۆشه‌کانی دیکه ده‌بێ ئیمکانـاتی چاره‌سـه‌رکردن و چاودێری بۆ دابین بکرێت. تا به‌دوای چاره‌سه‌ربوون له‌و نه‌خۆشییه بگه‌رێته‌وه نێـو کۆمه‌ڵگاو له هه‌موو مافێکی ئینسانی به‌شدار بێت.

# بەشی دووەم: بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا

## کورتە مێژوویەکی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا [40]

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، مێژووی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار ساڵ پێش ئێستا. هەروەك گوترا بەنگ وەك ماددەیەکی دەرمانی لە ئێرانی پێش ئیسلام هەبووە، بەڵام هیچ چەشنە بەڵگەیەك لە بەردەستدا نییە دەری بخات ئەفیون (تریاك) لەو سەردەمانە ناسرابێت و ئێرانییەکان بەمەبەستی رابواردن یا دەرمان بەکاریان بردبێت. لە نێو شیعر و پەخشانی فارسیدا، لە سەدەی چوارەمی هیجری بەم لاوە دەستکەوتووە، تریاك وەبەرچاو دەکەوێت.

فەرخی شاعیری کۆتاییەکانی سەدەی چوار و سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی هیجری (هەزار ساڵ پێش) دەڵێ:

**گروان گرفته پیش ممیر میلتن        سستی چو مستی که خورده باشد افیون**

شیخ ((فرید الدین عطار)) لە شاعیرەکانی سەدەی شەشەمی هیجری هێناویەتی:

**عطار کار در حسن او مدهوش شد        گز لبش تریاک افیون می کند**

مامۆستا ((حسین مسرور)) شاعیری هاوچەرخی ئێرانی کە بۆ خۆی بەردەوام تریاکی بەکارهێناوە لە شیعرەکانی بەو شێوەیە دەدوێ:

**چیست یا رب این زهر آلوده تلخ کرکنار        خوشه آتیم فریبی مردانه مردم شکار**

**وقتی خونخوار و الهی هوستی قابیتی قلم        هوستی خطار و الهی وقتی کاملی هیار**

لە سەردەمی میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیر تا ساڵی 1908 چاندن و بازرگانی و بەکارهێنانی تریاك لە ئێراندا ئازاد بوو و هیچ یاسایەك لەم پەیوەندییەدا نەبوو.

تریاك هەروەك جگەرە لە دوکانەکاندا دەفرۆشرا. یەکەمین یاسا بە نێوی یاسای ((تحدید تریاك)) (دیاری کردنی چوارچێوەیەکی دیاریکراو) لە ساڵی 1908 لە 6 ماددە لە لایەن ئەنجوومەنی شورای میللی پەسندکرا.

لە پووشپەری 1927 یاسای ((انحصاری تریاك)) (دەوروەدانی تریاك) لە 16 ماددە لە لایەن ئەنجوومەنی شورای میللی پەسندکرا. بە پێی ئەم یاسایە بۆ یەکەمجار لە ئێراندا، کڕین و فرۆشتنی تریاك درایە دەوڵەت، بەڵام چاندنی خەشخاش هەروەك جاران بەدەست جووتیاران و بازرگانان بوو.

دەوڵەت بە دوای پەسەندکردنی یاسای ((انحصار دولتی تریاك)) لە ساڵی 1926 بۆ یەکەمجار یاسای سزادانی قاچاغچییانی تریاکی لە 14 ماددە بە پەسندی ئەنجوومەنی شورای میللی گەیاند.

لە ساڵی 1941 دەستەی دەوڵەت لەسەر پێشنیاری وەزارەتی دارایی چەند بڕیارێکی دەرکرد بە پێی ئەم بڕیارانە، وەزارەتی دارایی بۆی هەیە لەهەر شارستانێك کە پێویستی زانی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو، بە تووشبووان، تریاك بفرۆشێ و ئەو کەسانەی لە شوێنە گشتییەکان دا، تریاك بەکاربێنن بە پێی ئەم بڕیارە سزا بدرێن.

لە خولی چواردەیەمی ئەنجوومەنی شورای میللی گروپێك لە نوێنەرانی ئەنجوومەن پێکهاتبوون لە 65 نوێنەر، پێشنیاریانکرد چاندن و بەکارهێنانی تریاك لە ئێراندا قەدەغە بکرێ. هەندێك لە نوێنەرە بەناوبانگەکانی ئەنجوومەن کە نفووزێکی زۆریان هەبوو، وەك: دوکتۆر شەفەق، دوکتۆر جەلال عەبدە،

ئەبولفەزل حاتەمی، دوکتۆر زەنگەنە، دوکتۆر موعەزەمی، سەردار فاخیر حیکمەت، عیماد توربەتی، سەیف پورکازمی و فراکسیونی حیزبی توودەی ئێران، ئەم تەرحە پێشنیاریان ئیمزا کرد.

پێشنیاری نوێنەرانی ئەنجوومەن لەلایەن دەوڵەت و ئەنجوومەن پەسەند نەکرا، لەبەر ئەوەی بەرنامەیەکی ڕێکوپێك بۆ بەرەبەرەکانی لەگەڵ قاچاغچییان و لەریشە دەرهێنانی تووشبوون و دابینکردنی دەیان میلیۆن تمەن هەزینەی دابینکردنی دەرمان و داخلکردنی تووشبووان لە توانای دەوڵەتدا نەبوو.

## یاسای پشتگیری لە چاندنی خەشخاش و بەکارهێنانی تریاک

لە ساڵی 1925 ئەنجوومەنی شورای میللی یاسایەکی پەسەند کرد بە پێی ئەم یاسایە دەوڵەت دەبێ لە ماوەی 6 مانگ داخلکردن و فرۆش و بەکارهێنانی مەشروب، کڕین و فرۆشی تریاك و ئەو ماددەیەی لە تریاك دروست دەکرێ و هەروەها چاندنی خەشخاش لە ساڵی 1954 قەدەغە بکا.

## کەمبوونەوەی رادەی تووشبووان

چاندنی خەشخاش لە ساڵی 1956 بە دواوە لە ئێراندا راگیرا. هەر بۆیە بە دوای پەسەندکردنی یاسای پشتگیری لە چاندنی خەشخاش رادەی تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا رۆژ بە رۆژ کەمی دەکرد.

چاندنی دووبارەی تریاك و سەرهەڵدانی دووبارەی تریاك بەهۆی هاتنە ناوەوەی لە رادەبەدەری تریاکی قاچاغ لە تورکیە، ئەفغانستان و پاکستان بەرادەیەکی زۆر پارە و زێری ئێران چووە دەرەوەی وڵات، هەر بۆیە دەوڵەت هاتە سەر ئەو بڕوایە چاندنی خەشخاش و بەکارهێنانی ئێوخۆیی و پێداویستییەکانی تووشبووان گەڵاڵەیەك بە ئەنجومەن پێشنیار بکا. ئەم گەڵاڵەیە، لە ساڵی 1968 لە 9 ماددەدا لەلایەن ئەنجوومەنی شورای میللی پەسند کرا.

## شۆڕشی ئیسلامی و مادده هۆشبەرەکان

شۆڕشی ئیسلامی ئێران بە رێبەری خومەینی 22ی رێبەندانی ساڵی 1979 سەرکەوتنی وەدەستهێنا. ئەم حکوومەتە، تەواوی یاساکانی پەیوەندیدار لەگەڵ تریاکی هەڵوەشاندەوەو بە پێی یاسای نوێ چاندن، بەکارهێنان و کڕین و فرۆشی مادده هۆشبەرەکانی قەدەغە کرد. بەڵام ئەوەی لە دوارۆژی ئەم حکوومەتە و سیاسەتەکانی دەرکەوت لەگەڵ، ئەم یاسایە یەکی نەدەگرتەوە. بە دوای هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی نەتەنیا پێش بە چاندنی خەشخاش و شادانە نەگیراوە، بەڵکو رادەی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان لەگەڵ پێش هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامیدا بەراورد ناکرێ و بە میلیۆنان کەس لە خەڵکی ئێران گیرۆدەی ئەم ماددمیە بوون و زۆر بە ئاسانی، ئەم ماددەیە لە هەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەدا دەست دەکەوێ. تەنانەت بەشێکی زۆر لە بازرگان و بڵاوکەرانی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، بەرێوەبەرانی رژێمن و بەپێی سیاسەتی ئەم رژێمە پەرە بە بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا دەدەن. لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بەوردی لەسەر ئەم سیاسەتە و چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا دەدوێن.

## هەڵکەوتی جوگرافی ئێران [41]

وڵاتی ئێران بە 1648195 کیلۆمەتری چوارگۆشە رووبەر، حەڤدەیەمین وڵاتی جیهانە. ئەم وڵاتە لە کیشوەری ئاسیا و لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست هەڵکەوتووە. مێژووی سەربەخۆیی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار ساڵ پێش ئێستا.

ئێران لە باکوورەوە، لەگەڵ وڵاتەکانی ئازەربایجان (767 کیلۆمەتر) ئەرمەنستان (40 کیلۆمەتر)، تورکمەنستان (1206 کیلۆمەتر) لە رۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ئەفغانستان (945 کیلۆمەتر)، پاکستان (978 کیلومەتر)، لە رۆژئاواوە لەگەڵ

عێراق (1609) و تورکیه (486 کیلۆمەتر) هاوسنووره، هەروەها لـه باشـووره‌وه (2043 کیلۆمەتر) سنووری دەریایی هەیه و لەو ڕێگایەوه لەگەڵ وڵاتانی کەنـداو وەك ئیمارات، قەتەر، کوێت، بەحرین، عەربستان و عومان هاوسنووره.

خاکی ئێران بەسەر (30) پارێزگا دابەشکراوه. بـەپێی سـەرژمێری سـاڵی 1996 دانیشتوانی ئێران 60.0550.000 کەسه و بەپێی دوایـین سـەرژمێری کـه سـاڵی 2006 کراوه دانیشتوانی ئەم وڵاته 70 میلیۆن کەسه و پایتـەختی ئێـران شـاری تاران به دانیشتوانی 6758845 کەسه (1996). ئێونجی تەمەنی له ئێرانـدا، 62 ساڵه. له دانیشتوانی ئێران 61.31٪ی لـه نێـو شـارەکان و38.34٪ ی لـه نێـو گوندەکان دەژین.

نـەژادی خـەڵکی ئێـران ئاریاییـە و نەتـەوەکانی فـارس 48٪، ئـازەری27٪، کورد13٪ و عەرەب بەلوچ تورکمـەن12٪ پێـك هـاتوون[42]. ئـایینی ئێـران لـه 98٪ی موسلمان و 2٪ی زەردەشتی جوولەکه و مەسیحی... هتد پێکهاتووه.

## ڕادەی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان له ئێراندا

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، مێژووی بـەکارهێنانی مـادده هۆشـبەرەکان لـه ئێراندا، دەگەڕێتەوه بۆ سەدان ساڵ پێش ئێستا مـرۆڤ بـه شـێوازی جـۆراو جـۆر بەکاری هێناوه و گـیرۆدەی ئـەم مادەیـه بـووه. بـەڵام بـه بـەراورد لەگـەڵ ئـەو سەردەمه و کات هاتنه سەرکاری ڕژێمـی کۆمـاری ئیـسلامی بـەم لاوه مـادده هۆشـبەرەکان بـه ڕێژەیـەکی سەرسـوورهێنەر لـه نێـو ئێرانـدا، بڵاوبووەتـەوه و بەشێکی زۆر له خەڵکی ئەم وڵاته گیرۆدەی بوون و به بەردەوامی بەکاری دێنن.

ئەگەر ئاوڕێك له کۆمەڵگای ئێران بدەینەوه، بەکارهێنان و ڕاهاتنی بەشێکی زۆر له خەڵکی ئێران به مادده هۆشبەرەکان له ڕواڵەتیانـدا، دیـاره و زۆر بەئاسـانی مادده هۆشبەرەکان وەدەست دێنن و به بێ هیچ کۆسپێك لەسەر ڕێیاندا بـەکاری

دێنن. بەپێی ئاماری فەرمی حکوومەتی ئێران زیاتر 2٪ی خەڵکی ئێران بە مادده هۆشبەرەکان راهاتوون و بە بەردەوامی بەکاری دێنن'[43]'. ئەم ڕێژەیە بە بەراورد لەگەڵ ئامارە نافەرمییەکاندا یەك ناگرێتەوە. بە پێی ئامارە نافەرمییەکان زیاتر لە 10٪ی خەڵکی ئێران تووشی ئەم ماددەیە بوون و بە بەردەوامی بەکاری دێنن'[44]'.

لە ئێرانی ئەمرۆدا، کڕین و فرۆش و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان بووەتە ژیانی رۆژانەی بەشێکی بەرچاو لە خەڵکی ئێران و بەبێ هیچ کۆسپ و مەترسییەك بازرگانی بەم بەڵایە (مادده هۆشبەرەکان) دەکەن و بەکاری دێنن. ئەم ماددەیە رووی کردووەتە تەواوی شوێنەکانی ئەم وڵاتە بە تایبەتی ئەو شوێنانەی بۆ پێگەیاندن و فێرکردنی لاوان پێکهاتوون. لە پارەکاندا، زۆر بە ئاسانی لەلایەن قاچاغچییانەوە، ئەم ماددەیە دەفرۆشرێ و هەر لەوێشەوە بە ئاشکرا بەکاری دێنن. لە سەیرانگەکان، شەقامەکان، شوێنە گشتییەکان، زانکۆ، بەشە ناوخۆییەکان قوتابخانە ناوەندی و دوا ناوەندییەکان، سەربازگەکان، بەرێوەبەرایەتییەکان، بنکە نافێرکارییەکان و تەنانەت لەناو ماڵەکان زۆر بە شێوەیەکی بەرچاو بازرگانی بەمادده هۆشبەرەکان دەکرێ و بەکارهێنانیشی بە شێوەیەکی ئاشکرا هەست پێدەکرێ. ئەم ڕێژەیە رۆژبەرۆژ لە پەرەسەندن دایە و لاوان بە کوڕ و کچەوە بەکاریدێنن و هیچ چەشنە فشارێکیان بۆ بەکارنەهێنانی ئەم ماددەیە ماڵوێرانکەرە لەسەرنییە. بەداخەوە ئێران بووەتە یەکێك لە گەورەترین بازاڕەکانی بازرگانیکردنی مادده هۆشبەرەکان و ئەم بازاڕە یەکێك لە گەورەترین بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکانی لە ئاستی جیهاندا دروستکردوە. بەپێی دوایین سەرچاوە رۆژانە لە ئێراندا 4 تەن (4 هەزار کیلۆ) ماددەی هۆشبەر بەکاردەهێنرێت'[45]'. بازرگانی بە مادده هۆشبەرەکان نە تەنیا لە نێو شارەکان بەڵکو بە شێوەیەکی زۆربەرچاو رووی کردووەتە گوندەکانیش و خەڵکی ئەم دەڤەرانە بە ڕێژەیەکی زۆر بەرچاو ئەم ماددەیە بەکاردێنن و لەگەڵی راهاتوون.

به پێی ئامارێك له لایەن ((د. انصاری راد)) سەرۆکی رێکخراوی ((بهزیستی)) بلاّوی کردووەتەوە (2001)، چوونە سەری رێژەی ژمارەی تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا پێنج بەرابەری چوونەسەری رێژەی دانیشتوانی ئێرانە[46]. تەمەنی تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، لە نێوان 18 تا 45 ساڵە و سەدی 80ی تووشبووان لە لاوان و کەسانی خوارەوەی 30 ساڵ پێکهاتوون[47]. دیاردەیەك زۆرتر دەبێتە جێگای مەترسی ئەوەیە، جگە لەوەی ژمارەی تووشبووان تا دێت زۆردەبێت. تەمەنی گیرۆدە بوون بە ماددە هۆشبەرەکان هاتووەتە خوار و تەنانەت لە بەکارهێنانی تریاك و حەشیش روویان کردووەتە هیرۆیین و بە پێی بەراوردێك کە کراوە تەمەنی تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا (لە ساڵی2001)، گەیشتووەتە 27 ساڵ[48]. زۆربەی ئەوانەی تێکەڵاوی ماددە هۆشبەرەکان بوون و بەکاریانهێناوە زۆرتر لە نێوان تەمەنەکانی 18 تا 22 ساڵەوە بووە[49]. راستییەکی دیکەش، لە پەیوەندی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکاندا بەرچاو کەوتووە. پەرەگرتنی نەخۆشی ئەیدز لە رێگای تووشبووانی بەهۆکاری دەرزی لێدانەوە. (ئەو کەسانەی هیرۆئینی گیراوە لە دەرمانەکانی خوێنی خۆیان بە دەرزی لێدان). دوو لە سێی تووشبووانی تەزریقی لەم رێگایەوە تووشی نەخۆشی HIV بوون و ئەم مەترسییەیان لەسەرە[50]. بە پێی ئامارێکی دیکە لە دوو ساڵی 77 و 1378 (1999، 2000) ئەو کەسانەی بە هۆی خواردنەوەی ماددەی سەمی (کوشندە) لە نەخۆشخانەی ((لقمان حکیم)) ی تاران گیانیان لەدەستداوە 47٪یان تریاك و مورفینیان بەکارهێناوە و لەو رێژەدا 71٪ یان پیاو و 29٪یان ئافرەت بوون. هەروەها بە پێی قسەکانی ((بەختیاری)) بەرپرسی ئەوکاتی ((سازمان زندانهای کشور)) (2001) لە 156 هەزار بەندی یەك کە پێویستیان بە چاودێری پزیشکی هەیە، 67٪یان تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان بوون[51]. هەموو هاوڵاتییەکی ئێرانی (بە هەموو نەتەوەکانییەوە) دەزانن، بە رێژەیەکی زۆر لە لاوان و خەڵکی ئێران، ماددە هۆشبەرەکان

بەکاردێنن. ئەو ماددەیە لە هەموو جۆرەکانی، بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی لە هەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەدا، دەست دەکەوێ و ئەو کەسانەی بڵاوی دەکەنەوە، هەموویان لە نێو خەڵکیدا، ناسراون و بەبێ هیچ مەترسییەك درێژە بەکاری خۆیان دەدەن! ئەوە لە کاتێکدایە یاسا لە ئێراندا بۆ ماددە هۆشبەرەکان زۆر توندوتیژە بەڵام هەرگیز ئەو یاسایە بەڕێوە نەچووە. بەداخەوە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان تەنیا لە نێو کوڕان و پیاواندا بڵاونەبووەتەوە، بەڵکو ئەم دیاردە ماڵوێرانکەرە، لە نێو کچانیشدا، پەرەی سەندوەو بەشێکی زۆر لە کچان بە تایبەتی خوێندکارانی زانکۆ بەکاری دێنن و بووەتە یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای ئێران. ڕێژەی تووشبوونی ئافرەتان بە ماددە هۆشبەرەکان لە بەراورد لەگەڵ پیاواندا، روو لە زۆر بوونە و لە هەندێك لە شارو ناوچەکانی ئێران ڕێژەی تووشبووانی ئافرەت لە پیاوان زۆرترە. ژنانیش هەروەك پیاوان بازرگانی بە ماددە هۆشبەرەکان دەکەن و بەشێکی زۆر لە گیرۆدە بووەکان، بێوەژنان، خوێنکارانی زانکۆ و... بۆ وەدەست هێنانی بژێوی خۆی و بنەماڵەکانیان ناچارن بازرگانی بە ماددە هۆشبەرەکان بکەن.

بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا بە شێوەیەکە، تەنانەت ئەو شوێنانەی لەگەڵ دنیای دەرەوەی خۆیاندا، پەیوەندی یان نییە، وەك سەربازگەکان و بەندیخانە بەکاریدێنن. بە پێی لێکۆڵینەوە لە هەندێك لە تووشبووان، لە نێو بەندیخانە و سەربازگەکان بە ڕێوەبەران بە ئاشکرا بازرگانی بەم ماددەیە دەکەن و زۆرکەسیش لە بەندیخانە یا لە سەربازگەکاندا تووشی ئەم ماددەیە بوون و ناسیویانە! بە گشتی لە ئێراندا، لە هەموو شوێنێك ماددەی هۆشبەر دەستدەکەوێ و بەکارهێنانی زۆر ئاساییە و زیاتر لە 50٪ی خەڵکی ئێران ئەم ماددەیانە تاقیکردووەتەوە و رووی روخسار و قەڵافەتی خەڵکییەوە زۆر بە ئاسانی تووشبووان لە خەڵکی ئاسایی جیادەکرێنەوە. بە پێی دوایین سەرچاوە ساڵی (2005)، پێنج هەزار کەس لە ئێراندا بە هۆی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان گیانیان لە دەستداوە [52].

## هۆیەکانی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، بۆ هەڵکەوتوویی جوگرافیایی ئێران دەگەڕێتەوە. ئەم وڵاتە لەسەر ڕێگای بەرێکردنی مادده هۆشبەرەکان بۆ ئەورووپا و وڵاتانی کەنداو هەڵکەوتووە. یەکێك لە وڵاتانی هاوسنووری ئێران، ئەفغانستانە، ئەم وڵاتە 945 کیلۆمەتر لەگەڵ ئێران سنووری هاوبەشی هەیە. ئەفغانستان گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنەری مادده هۆشبەرەکان لە جیهاندایە و هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، 85٪ی مادده هۆشبەرەکانی جیهانی لە ساڵی 2005 بەرهەمهێناوە. بەشێکی زۆر لەو ماددەیە لە ڕێگای سنوورەکانی ئێرانەوە بۆ دەرەوەی ئەفغانستان بەرێدەکرێ، هەر بۆیە هەندێك لە خەڵکی ئێران تێکەڵاوی بازرگانیکردن و قاچاغی ماددەیە لە سنورەکانی ئێران - ئەفغانستان و پاشان بەرێکردنی بۆ وڵاتانی ئەورووپایی بوون. ئەم مەسەلەیە شوێنەواری لەسەر کومەڵگای ئێرانیش داناوە و ئێرانی کردووەتە یەکێك لە گەورەترین بازاڕەکانی فرۆشی مادده هۆشبەرەکان و خەڵکێکی زۆر گیرودەی ئەم مادده ماڵوێرانکەرە بوون.

هاوسنووری ئێران و ئەفغانستان ڕێگای هاتنەژووری مادده هۆشبەرەکانی بۆ نێو ئێران کردووەتەوە و بە ڕێژەیەکی زۆر بەرچاو ئەم ماددەیە لە ئێراندا بڵاوبووەتەوە. بەڵام هۆکارەکانی تووشبوون و تێکەڵاو بوونی خەڵکی ئێران بەم ماددەیە دەگەڕێتەوە سەر چەند هۆکارێك و ئەم هۆکارانە بە گشتی پەیوەندییان پێکەوە هەیە و لەم بەشەدا، ئاماژە بە هەموو خاڵەکانی دەکەین.

### 1- بێکاری

بە پێی بەرنامەی فێرکاری لە ئێراندا، زۆربەی لاوان بە دوای تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی ناتوانن درێژە بە خوێندن بدەن و واز لە خوێندن دێنن، بەبێ ئەوەی داهاتوویەکی روونیان هەبێ. تەنانەت ئەو لاوانەش خوێندن لە قۆناغەکانی

سەرەوەتر (زانکۆ) کۆتایی پێ دێنن، بەشێکی زۆریان بە بێ ئیش وکار دەمێننەوە. لەو پەیوەندییەدا ((قلی شیخی)) وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی لە ساڵی 2000 گوتی: ساڵانە 200 هەزار کەس لەو خوێندکارانەی کۆتایی بە خوێندن دێنن، بە دانیشتوانی بێکاری ئێران زیاد دەبن کە 100 هەزار کەسیان، لەو کەسانەن لە (زانکوی ئازادی ئیسلامی) کۆتایی بە خوێندن دێنن[53].

ئەو لاوانە بە هەزار ئاوات و ئارەزوو بۆ داهاتووی خۆیان دێنە نێو کومەڵگایەکی ئاڵوودە بە ئابوورییەکی لاواز و رژێمێکی دواکەوتوو، کە لەسەرەوەی هەموو شتێك گرانی، بێکاری و گەندەڵی (بە هەموو جۆرەکانی) خۆی دەنوێنێ. ئەو لاوانە چۆن داهاتووی خۆیان دروستبکەن؟ هێزی کار زۆرە و لە بەرامبەریشدا، ئیش وکار زۆرکەمە و بە زەحمەت دەستدەکەوێ. تەنانەت داهاتی ئەو کەسانەی کاریان هەیە زۆر کەمەو پێداویستییەکانی ژیانیان لە داهاتوودا بۆ دابین ناکات، هیوایان زۆرکەمە. بە پێی ئامارێك کە لە ساڵی 1996 ئەنجامدراوە و دەریخستووە کە نزیکەی 9٪ ی خەڵکی ئێران بێکارن[54]. دیارە ئەو رێژەیە ئێستا زۆرتر بووە. هەروەها زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ئێران لە ژێر هێڵی هەژاریدا دەژین (واتە داهاتیان بەشی بژێوی مانگانەیان ناکات). هەر بۆیە بەشێکی زۆریان روو دەکەنە پیشەی دووهەم و لەوانەیە ئەم پیشەیە قاچاغ بێت.

## 2- گرفتی دەروونی

بە پێی ئاماری (رێکخراوی تەندروستی جیهان) پێنج میلیۆن کەس لە خەڵکی ئێراندا، تووشی غەم و پەژارەی دەروونی بوون و هەروەها 10٪ی قوتابیان و خوێنکارانی زانکۆ ئاڵوزی فیکری و دەروونی یان هەیە [55].

ئەو گرفتە دەروونییانە لە چییەوە سەرچاوە دەگرن؟ بێکاری، نەبوونی داهاتوویەکی روون و گرفتەکانی دیکەی ژیان کە لە درێژەی ئەم بەشەدا، ئاماژەی پێدەکەن، پێکهێنەری ئەم گرفتە دەروونییانەن و بۆ رزگاربوون لەو گرفتانە روو لە ماددە هۆشبەرەکان دەکەن.

## 3- نەبوونی پەروەردە

پەروەردەکردنی لاوان لە ئێراندا، زۆر لاوازە و هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا خوێندنی باڵا، ئەم لاوازییە بەرچاو دەکەوێ. ئەو مامۆستایانەی ئەرکی پەروەردەکردنیان لەسەر شانە، زۆرتر لە بواری ئایدۆلۆژییەوە و لە چوارچێوەی نیزامی کۆماری ئیسلامی و لە قازانج و بەرژەوەندییەکانی ئەم حکومەتەدا دەدوێن. قوتابخانە شوێنی پەروەردەکردنی لاوان و تێگەیاندنیان بۆ ژیانێکی دروستە کەچی قوتابخانە و زانکۆکانی ئێران بوونەتە شوێنی کاری خراپ و کڕین و فرۆشتن و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، لەو بوارەدا هیچ جۆرە کۆنترۆڵێک لە قوتابخانە و زانکۆکان لە ئارادانییە. مامۆستای تایبەتی بۆ پەروەردەکردنی قوتابیان زۆر کەمە و ئەوانەش هەن شارەزاییان زۆر کەمەو بە شێوەیەکی لاوەکی سەیری ئەرکەکانیان دەکەن.

لە ئێراندا پێداویستییەکانی وەرزشی بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی لاوان زۆر کەمە و لەو بوارەدا، سەرمایەگوزاری زۆر لاوازە و لاوان بە حاڵی خۆیان پشتگوێخراون و ڕێنوێنی ناکرێن. تەنانەت هەندێك لە ئۆرگانەکانی ڕژێم ئەرکی بەرەولاڕێ بردنی لاوانیان هەیە. کە لە جێی خۆی دا باسی دەکەین.

## 4- نەبوونی بەڕێوەبەری دروستی خێزانی

یەکێکی دیکە لە گرفت و کێشەی تووشبووان بە مادده هۆشبەرەکان نەبوونی بەڕێوەبەرێکی دروست لە نێوخێزاندایە. لە ئێراندا بە هۆی گرانی و کەمبوونی داهاتی مانگانە،لەوانەیە باوك چەند شیش و کاری هەبێ و هەندێك جاریش دایکەکانیش بۆ یارمەتیدانی بە خەرجییەکانی ماڵەوەیان، روو لەکارکردن لە دەرەوەی ماڵ دەکەن و لەبەرامبەردا بەو شێوەیە کە پێویستە ئاگایان لە پەروەردەکردنی نامێنێ و هیچ کاتێکیان نییە تا بۆ ئەوان تەرخان بکەن و کاتێك دەگەڕێنەوە ماندوون و توانای قسەکردن و ئامۆژگاری منداڵەکانیان نییە و ئاگایان لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی منداڵەکان نییە.

بەشێکی دیکە لە بنەماڵەکان بە پێچەوانەی بەشی یەکەم، ژیانی خۆش و پارەی زۆر منداڵەکانیان بەرەو لاڕێ دەبات. ئەم بنەماڵەیە، بەهەر هۆیەك بووە پارەیەکی زۆریان دەستکەوتووە و هەموو جۆرە پێداویستیەکان بۆ منداڵەکان دابین کردووە و لەوە زیاتر ئاگایان لە منداڵەکان نابێت. باوکەکان لەبەر ئیش و کاریان هەمیشە لە سەردان و کۆبوونەوە و رابواردن و دایکەکانیش هەمیشە بە دوای مۆدیلاتی جل و بەرگ و ئۆتۆمبیل و جوانی خۆیاندا دەگەڕێن و منداڵەکانی خۆیان لەبیر چووەتەوە و منداڵەکانیش بە کەلکوەرگرتن لە پارە و پولی زۆر دەکەونە دوای رابواردن و لەگەڵ برادەرەکانی بەرەو لاڕێدا دەڕۆن.

هێندە جاریش سەرپەرستی خێزانەکان وەك: باوك، دایك و برا، بۆ خۆیان دەبنەوە هۆی تووشبوونی ئەندامی بنەماڵە بە ماددە هۆشبەرەکان. ئەو کەسانە بۆ ئەوەی فشاری بنەماڵەی یان بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لەسەر نەبێ، ئەوانیش بەو بەڵایە ئالوودە دەکەن. لەو پەیوەندییەدا بە هەزاران خێزان لە ئێراندا هەیە هەموویان گیرۆدەی ماددە هۆشبەرەکان بوون.

## 5- گەندەڵی ئیداری

گەندەڵی لە نێو رژێمی کۆماری ئیسلامیدا، هەر لە یەکەم رۆژەکانی هاتنە سەر کاری ئەم رژێمە تا گەیشتووەتە ئێستا بە شێوەیەکی بەرچاو، تەواوی ئیدارەکان دەگرێتەوە بووەتە یەکێك لە گرفتەکانی خەڵکی لەکاری رۆژانەیان. بەداخەوە لە ئێراندا، پەیوەندییە یاساییەکان جێی خۆیان داوەتە، پەیوەندییە بەرژەوەندیەکان ئەو نیشانەی قازانج و بەرژەوەندی بە رێوەبەرانی ئیدارەکانی تێدا نەبێت بەرێوەی نابەن.

زۆربەی قاچاغچییانی ماددە هۆشبەرەکان بەدوای گیرانیان لە لایەن دەزگا ئەمنیەتییەکانی رژێم بەدانی بەرتیل ئازاد دەکرێن و درێژە بە ئیش و کاری خۆیان (بازرگانی بە ماددە هۆشبەرەکان دەدەن). زۆرجاریش بەرپرسانی حکوومەتی بەوەرگرتنی بەرتیل رێگا خۆشکەری بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکانن.

## 6- جیاوازی کۆمەڵایەتی

لە ئێرانی ئەمڕۆدا، زۆربەی خەڵکی لەژێر (هێڵی هەژاری و کەم داهات) دا دەژین. ئەم مەسەلەیە لە بواری کۆمەڵایەتییەوە شوێنەواری لەسەر ژیانی خەڵکی داناوە و چینی کەم داهاتی ئەم وڵاتە بۆ وەدەستهێنانی بژێوی خێزانەکانیان روو لە هەموو جۆرە ئیش و کارێك دەکەن و زۆرجار بە بێ ئەوەی ئاگادار بن یا بە شێوەیەکی زۆر خێرا خۆیان لە نێو ئیشی قاچاغ دەبیننەوە. ئەم نیشانە دەبنە سەرەتایەك بۆ ئەوەی لە داهاتوودا تێکەڵی ماددە هۆشبەرەکان بن. جیاوازییە کومەڵایەتی یەکان زۆرجار گرفتی کۆمەڵایەتی دروستدەکات و ئەو گرفتانەش یەکێك لە هۆکارەکانی تێکەڵ بوون بە ماددە هۆشبەرەکانن.

## 7- کچان و ماددە هۆشبەرەکان

رێژەی کچانی تووشبوو بە ماددە هۆشبەرەکان، ئەگەر لە کوڕان زۆرتر نەبێت کەمتریش نییە. ئەم گرفتە چەند ساڵێکە لە نێوان کچانیشدا، بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو پەرەیسەندووە و کچانی ئەم وڵاتەی ئالوودە و تێکەڵ بە ماددە هۆشبەرەکان کردووە. هۆکارەکانی تووشبوونی کچان بە ماددە هۆشبەرەکان بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە:

یەکەم: لە نێو کچاندا، وا بڵاوبووەتەوە، بە کارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی گراس و حەشیش گوایا چاویان جوان و بادامی دەکات. هەر بۆیە هەندێك لە کچان تووشی هەڵە دەبن و تەنیا لەبەر جوانی کورتخایەنی خۆیان، تێکەڵی ماددە هۆشبەرەکان دەبن. ئەم دەستەیە لە کچان بەدوای راهاتن و تووشبوون ناتوانن وازی لێ بێنن و تەنانەت پارەی پێویست یان بۆ کڕینی ماددە هۆشبەرەکان نیە، هەر بۆیە تووشی کاری خراپ و لەشفرۆشی دەبن، ئەم مەسەلەیە لە نێو کچانی خوێندکاری زانکۆ لە بەشە ناوخۆییەکاندا دەژین زۆر بەرچاوە.

دووهەم: بەشێکی دیکە لە کچان لە ڕێگای تێکەڵاوی لەگەڵ کوڕانی تووشبوو بە ماددە هۆشبەرەکان دەکەونە داوی ئەم ماددە ماڵوێرانکەرەوە. بەداخەوە ماددە هۆشبەرەکان لە نێو کچانیشدا، هەروەك کوڕان بڵاو دەبێتەوە و بەشێکی زۆر لە کچان و ئافرەتان لە ڕێگای بازرگانی کردن بە ماددە هۆشبەرەکان خەرجی بژێوی خۆیان و بنەماڵەکانیان وەدەست دێنن. لە قوتابخانە و شوێنە ناموزشییەکانی کچانیشدا، ماددە هۆشبەرەکان بە شێوەیەکی زۆر بەربڵاو دەست دەکەوێ و تووشبووان بە ئاسانی بەکاری دێنن.

## 8- نەبوونی ڕێنوێنی لەلایەن حکوومەتەوە

ڕێژەیەکی زۆر لە حەشیمەتی ئێران لە لاوان و تازە پێگەیشتووان پێك هاتووە. بەڵام ئەم ڕژێمە بۆ پێگەیاندن و بارهێنانی لاوان زۆر کەمتەرخەم بووە و بەو شێوەیە پێویست بووە هەنگاوی هەڵ نەگرتووە. لاوان پەروەردە نەکراون و پێداویستی پێویستیان بۆ تەرخان نەکراوە و تەنانەت ئەو ڕێنوێنییە پێویستانەی دەبێ لە تەمەنی لاوەتیدا بکرێن، بێبەش دەبن.

لە ئێراندا، ڕێکخراوی تایبەتی بە کاروباری لاوان نییەو تەنانەت وەزارەتێکی تایبەتی بۆ کاروباری لاوان پێراگەیشتن یان پێك نەهاتووە. تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانیش زۆرتر بەرنامەی ئایینیان هەیە و کەمتر لە لایەن لاوانەوە سەیر دەکرێن و لاوان نازانن کاتی بێکاری خۆیان چۆن بەرنەسەر. ئەو گیرو گرفتانەی باسکران، هەموویان پێکەوە دەبنە هۆی پێك هاتنی ناڕاحەتی دەروونی و فیکری لە نێو خەڵکی ئێراندا، بە تایبەتی لاوان و شوێنەوار لەسەر هێزی ئیشکەری وڵات دادەنێ کە تەمەنیان لە نێوان 18 تا 45 ساڵە و بەرەبەرە تووشی کاری خراپ و بەرەلاری یان دەبات. لەگەڵ هەمووی ئەو شتانەی کە باسکران، رادەی بڵاوبوونی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، شوێنەوارێکی زۆری لە نێو کۆمەڵ داناوە و خەڵکیش بۆ ئەوەی لەو

گیروگرفتانەی ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ بێتەدەر، روو دەکاتە ماددە هۆشبەرەکان. سەیر ئەوەیە لەسەر شوێنەوار دانانی ئەم ماددەیە لەسەر لەش و دەروونیان بە باشی ئاگادارن. بەو حاڵەش بەکاری دێنن.

## هۆیەکانی تووشبووان لە بواری سیاسییەوە

هەر لە یەکەم رۆژەکانی هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی، ئەم رژێمە سیاسەتی ((صدور انقلاب)) بەرێکردنیی گرتە پێش. لەو پێناوەدا بە دەیان میلیارد دولار لە داهاتی گشتی وڵات سەرفی پێکهێنانی حیزب و رێکخراوی توندرەوی ئیسلامی لە وڵاتانی جیهانی ئیسلام کردووە. بە تایبەتی لە وڵاتی لوبنان، ئەفغانستان، پاکستان و فەلەستین... شوێنەواری سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران زۆر زەق و بەرچاوە. لە هەر وڵاتێکی ئیسلامی رێکخراوێکی توندرەوی ئیسلامی پێکهاتووە لە لایەن ئێرانەوە پشتیوانی ماددی دەکرێ. یارمەتییە مادییەکانی ئێران بە ((حزب الله))ی لوبنان، ((حماس)) لە فەلەستین و هەروەها رێکخراوە ئیسلامییە توندڕەوەکانی عێراق بە تایبەتی سوپای ((مهدی)) بەرێبەری ((موقتدا صدر)) شاراوە نییە. ئەم یارمەتی و پشتیوانییە ماددیەی ئێران شوێنەواری لەسەر ئابووری ئێران داناوە و وڵاتێك خاوەنی نەوتێکی زۆرە، بەڵام ئێستا قەرزەکانی ئەم وڵاتە خۆی لە دەیان میلیارد دولار دەدا. سەرمایەی ئێران بەشێکی بەرچاوی لە رێگای سیاسەتەکانی رژێم کە هەموو لە چوارچێوەی بەرێکردنی شۆڕش و دروستکردنی ئیمپراتوورییەکی ئیسلامی شیعە خەرج دەکرێ. لەنێو خۆی وڵاتیشدا، ئەم سیاسەتە شوێنەواری داناوە، نەبوونی سەرمایەگوزارییەکی دروست و بە فیڕۆدانی داهاتی نەوتی وڵات، کاریگەری کردووەتە سەر ئابووری وڵات و ژیانی خەڵکی و ئابووری وڵاتی بەرەو لاوازی بردووە و پارەی ئەم وڵاتەی لەچاو ساڵانی پێشوو زۆر بێ بەهای کردووە. ساڵی 1978 هەر دولارێکی ئەمریکی 7 تمەنی ئێران بوو، بەڵام ئێستا دولارێکی ئەمریکی 900

ئەمنی ئێرانە! رژێم لەبەر سیاسەتەکانی خۆی و سەرفکردنی داهاتی وڵات لە دەرەوەی ئەم وڵاتە ئاگای لە نێو خۆی وڵات نییە و ئەم مەسەلەیە شوێنەواری لەسەر تەواوی ژیانی خەڵکی داناوە و لە هەموو بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، پەروەردە، روشنبیری، فێرکردن، وەرزش و... هتد خۆی دەنوێنێ. کێشەی نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون، نیش و کار، گرانی لە هەموو بوارێکدا، خراپەکاری، گەندەڵی ئیداری و دارایی و... لە بەرهەمەکانی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامییە. ئەم کێشە و گرفتانەیە دەبنە هۆی تووشبوون و تێکەڵاوبوونی دانیشتوانی ئێران بە ماددە هۆشبەرەکان.

ئیسلامی سیاسی بەتایبەتی توندڕەوە ئیسلامییەکان دوو پشتیوانی بەهێزی ماددییان هەیە و تا ئێستا، بە کەڵکوەرگرتن لەو پشتیوانییە بووە توانیویانە لە سەر پێی خۆیان راوەستن و سیاسەتەکانی خۆیان لە هەموو جیهاندا بەرنە پێش. ئەو دوو پشتیوانییە ماددییە، یەکەمیان: نەوت بووە و ئەوی دیکەمیان ماددە هۆشبەرەکانە. هەروەك ئاگادارن زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و ئێران خاوەن نەوتێکی زۆرن و ئەو نەوتە سەرچاوەی داهاتێکی زۆرە بۆ ئەو وڵاتانە و لەو بوارەدا، وڵاتانی عەرەبی کەنداو پشتیوانێکی زۆر باشی ئیسلامی سیاسی سەربە عەرەبستانی سعوودین. لە لایەکی دیکەوە ئەو وڵاتانەی نەوتیان نییە یا رێژە نەوتیان لە وڵاتانی دیکە کەمترە، لە رێگای بەرهەمهێنان، بازرگانیکردن و بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە بواری ماددییەوە خۆیان و ئیسلامی توندڕەویان بەرێوەبردووە. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، دەوڵەتی تالیبان داهاتی ساڵانەی لە ماددە هۆشبەرەکان زیاتر لە 35 میلیارد دۆلار بووە.
حکوومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران سەرەڕای داهاتی نەوتی، لە رێگای بازرگانی و بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان داهاتێکی زۆری هەیە و وەك چەکێکی سیاسی لە ماددە هۆشبەرەکان کەڵکی وەرگرتووە، هەر لەو پەیوەندییەدا وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئێران رایگەیاند ئەگەر رۆژئاوا، لە بەرامبەر مەسەلەی ناوەکی (ئەتۆمی) گەمارۆ بخاتە سەر ئێران، ئێرانیش ریگا بە

بەرێکردنی مادده هۆشبەرەکان بۆ رۆژئاوا دەدات و لەو پەیوەندییەدا گرفتیان بۆ دروستدەکات[56]. ئەم وتەیە ئەوە دەردەخا، ئێران بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەستی لە بازرگانی کردنی مادده هۆشبەرەکان و بەرێکردنی بۆ رۆژئاوا هەیە.

رژێمێك یەکێك لە سەرچاوە داهاتییەکانی مادده هۆشبەرەکان بێ، روون و ئاشکرایە لە نێوخۆی ولاتیش بۆ پەرەپێدانی سیاسەتەکانی رێگا بە بازرگانی و بەکارهێنانی ئەم ماددەیە ناگرێ. هەرچی لە نێوخۆی ولات تووشبوو بە مادده هۆشبەرەکان زۆرتر بێت ئەم رژێمە لە جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی سەرکەوتووترە. رژێم بۆ بەئاکام گەیاندنی سیاسەتەکانی خۆی هیچ سنوورێك ناناسێت و لەکاتی رووخانی رژێمی بەعسی سەددام بەم لاوە بە رێژەیەکی بەرچاوە، مادده هۆشبەرەکان سنوورەکانی ئێرانی بڕیوە و چوونەتە خاکی عێراق، بەشێکی زۆر لەم ماددەیە راستەوخۆ لە لایەن رژێمەوە ئاودیو کراوە و تەنانەت یەکێك لە هاوپەیمانە نیزیکەکانی ئێران لە عێراق واتە موقتەدا سەدر لەم دوایانەدا فتوای دەرکردووە هەم بازرگانی و هەم بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان حەلاڵە! ئەم فتوایە لە راستی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانە. ئەگەر بازرگانی بە مادده هۆشبەرەکان ئازاد بێت، لەم رێگایەوە داهاتێکی زۆر نەسیبی موقتەدا سەدر و چەکدارەکانی دەبێت و لە بواری ماددییەوە دەتوانن خۆیان بەرێوەبەرن. لە لایەکی دیکەوە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە نێو چەکدارەکانی حەلاڵ دەکا، لێرەشدا، ئەم بڕیارە لە بەرەو پێش بردنی سیاسەتەکانی وەك چەکێکی بێدەنگ یارمەتی یان دەکا. زۆربەی ئەو تیرۆریستانەی کردەوەی خۆکوژی بەرێوە دەبەن بەشێکی زۆریان لەو کاتەدا مرۆڤێکی ئاسایی نین و لەوانەیە مادده خەیاڵهێنەرمیان بەکارهێنابێت هەروەك سەردەمی حەسەن سەباح کاتێك دەچوون بۆ کردەوەی خۆکوژی حەشیشیان بەکاردەهێنا تا لە کاتی بەرێوەبردندا، ئاگایان لە چارەنووسی کردەوەکەیان نەبێت.

رژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران هەورەك چەکێکی بێدەنگ و تەنانەت دەتوانین بلێین کۆمەڵکوژ لە مادده هۆشبەرەکان کەڵکی وەرگرتووە و لە رێگای دەزگا تایبەتییەکانی خۆی لە ئێراندا بەتایبەتی کوردستان بڵاوکردووەتەوە. رژێمی بەعس بە کیمیایی بارانی هەڵەبجە 5000 کەسی شەهید کرد و لەوکاتەوە تا ئێستا گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان شانازی بەو شەهیدانە کردووە، بەڵام لە ئێراندا، بەتایبەتی کوردستان بە دەیان هەزارکەسی بەهۆی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان گیانیان لەدەستداوە و بە سەدان هەزار کەسیش ئەو ماددەیە بەکاردێنن و لەگەڵی راهاتوون، دەتوانین بڵێین ئەمانەش مردوون تەنیا جیاوازییان لەگەڵ مردووەکانی دیکە ئەوەیە، کە ئەمان هەناسە دەکێشن. کێ شانازی بە تووشبوو دەکات، ئەوەی کوڕی تووشبوو بێت هەست بە سەرشۆڕی دەکا. ئەوەی باوکی تووشبوو بێت شەرم دەکا بڵێ کوڕی کێیە. ئەم سیاسەتە لە دنیای دەرەوە هەستپێناکرێ و بە شێوەیەکی زۆر هێدی و بێدەنگ گەلێك نابوود دەکرێ، ئەمەیە چەکی کۆمەڵکوژی کوماری ئیسلامی.

## رێگاکانی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا

هەروەك دەزانن مادده هۆشبەرەکان بە شێوەیەکی زۆر بەربڵاو لە ئێراندا، بڵاو دەبێتەوە و ئەم ماددەیە لە هەموو شوێن و جێگای ئەم وڵاتە، زۆر بەئاسانی دەستدەکەوێ و بەکاری دێنن. چۆنیەتی هاتنە ژووری ئەم ماددەیە بۆ ئێران و بڵاوبوونەوەی لەم وڵاتەدا، چەند رێگای هەیە کە بریتین لە:

1- هەروەك ئاماژەی پێکراوە، ئێران لەسەر رێگای بەرێکردنی مادده هۆشبەرەکان بۆ ئەورووپا و وڵاتانی عەرەبی هەڵکەوتووە. قاچاغچییانی ئەم ماددەیە بە کەڵك وەرگرتن لەم هەڵەو خاکی بەرین و دانیشتوانی زۆری ئێران، بەشێك لەو ماددمیە لە نێو ئێراندا، بڵاو دەکەنەوە.

2- بەشێکی زۆر لە بەرپرسان و بەڕێوەبەرانی حکوومەتی ئێران بە کەڵکوەرگرتن لە بەرپرسایەتی خۆیان بەوەرگرتنی بەرتیل یا هاوکاری راستەوخۆ لەگەڵ مافیا، لەبەر بەرژەوەندی خۆیان ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا بڵاودەکەنەوە یا ڕێگا بە بڵاوبوونەوەی ئەم ماددەیە دەدەن. پێویستە بگوترێ ئەو ماددەیە لەم ڕێگایەوە بڵاو دەبێتەوە لە ڕێگای یەکەم زۆرترە و زۆر بە ئاسانی دەگاتە دەستی بەکارهێنەران و تووشبووان.

3- ڕێگای سێهەمی بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، راستەوخۆ پەیوەندی بە سیاسەتەکانی رژێمی ئێرانەوە هەیە و ئەو رژێمە لە ڕێگای کەسانی تایبەتی خۆی و ئۆرگانە پەیوەندیدارەکانی وەکو ئیتلاعات، هێزە ئینتیزامییەکان، (ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان) و... بە شێوەیەکی ڕێکخراو ڕێکوپێك ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، بڵاو دەکەنەوە و لەو پەیوەندییەدا، تەواوی ئەو کەسانەی ئەم کارە دەکەن و ماددەی هۆشبەر لە نێو خەڵکی بە تایبەتی لە کوردستاندا، بڵاو دەکەنەوە لە نێو خەڵکیدا ناسراون و ئەوانیش بە بێ هیچ چەشنە گرفت و کۆسپێك لەسەر ڕێگایاندا، ئەم ماددەیە بڵاودەکەنەوە. زیاتر لە نیوەی ئەو ماددە هۆشبەرانەی لە ئێراندا، بڵاو دەبێتەوە راستەوخۆ پەیوەندی بەم سیاسەتەوە هەیە و یاساکانی ئەم رژێمە سەبارەت بە ماددە هۆشبەرەکان تەنیا ئەو دەستەیە دەگرێتەوە کە لە ڕێگای یەکەمدا ئەم ماددەیە بڵاو دەکەنەوە.

## ماددە هۆشبەرەکان لە یاسای ئێراندا [57]

یاسای ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا، زۆر توندە و ئەگەر ئەو یاسایانە بە تەواوی بەڕێوە بچن گرفتی ماددە هۆشبەرەکان لەم وڵاتەدا، تا رادەیەکی زۆر چارەسەر دەکرێ بەداخەوە ئەم یاسایە تەنیا لە چوارچێوەی نووسیندا ماوەتەوە و زۆر بەکەمی بەڕێوە دەچێ.

## سزای لە سێدارەدان (مەرگ)

لەسەریە لە یاساکانی ئێران بۆ 22 تاوان سزای لە سێدارەدان دیاریکراوە و نموانەی تایبەت بە مادده هۆشبەرەکانن ناماژەیان پێدەکەین:

1- چاندنی خەشخاش، کوکا یا شادانە بە مەبەستی بەرهەمهێنانی مادده هۆشبەرەکان، جاری یەکەم تا سێهەم سزای زیندان و غرامەی لەسەرە، بەڵام بۆ جاری چوارەم بە پێی ئەم یاسایە لە سێدارەدان دەدرێ (ماددەی 2ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان).

2- هێنانە ژوور و بەرێکردن، دروستکردن، دابەشکردن یا فرۆشی زیاتر لە پێنج کیلۆ، بەنگ، چەرس، گراس، تریاك، شیرە، سوختە یا تفالەی تریاك حوکمی لە سێدارەدانی هەیە (ماددەی 4 ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان).

3- کڕین، راگرتن، شاردنەوە یا گواستنەوەی زیاتر لە 100 کیلۆ تریاك یا ماددەکانی دیکە کە لە ماددەی چواردا هاتوون حوکمی لە سێدارەدانی هەیە (ماددەی 5 ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان).

4- هێنانە ژوور، دروستکردن، دابەشکردن، بەرێکردن، کڕین و فرۆش، راگرتن، شاردنەوەی زیاتر لە 30 گرام هیرۆنین، مورفین، کوکائین و ئەو مادده کیمیاییانەی لە مورفین و کوکائین دروستدەکرێن حوکمی لە سێدارەدانی هەیە (ماددەی 8 ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان).

5- بەرێکردن، دروستکردن، دابەشکردن، هێنانە ژوور، کڕین و فرۆش، راگرتن و شاردنەوەی هیرۆنین، مورفین، کوکائین و ماددەکانی کیمیایی کە لە مورفین و کوکائین دروستدەکرێ بۆ جاری چوارەم و کۆی هەموو جارەکان بگاتە 30 گرەم (ماددەی 8 ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان) حوکمی لە سێدارەدانی هەیە.

6- قاچاغی مادده هۆشبەرەکان بە چەکەوە حوکمی لە سێدارەدانی هەیە (ماددەی 11ی یاسای خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان).

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا ئەم یاسایە لە ئێراندا زۆرتر لە چوارچێوەی نووسراوەدا ماوەتەوە و بەو شێوەیە بەڕێوە ناچێ و هەر ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی ماددە هۆشبەرەکان و بازرگانی کردن بەم بەڵا ماڵوێرانکەرە ئاسایی بکرێتەوە.

## ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان- سەرۆك كۆماری [58]

ئامانج: خەباتی هەمەلایەنە دژی قاچاغ و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە کەڵکوەرگرتن لە هەموو پێداویستییەکان و سەرچاوەی پێویست وەك: بەڕێوەبەری، فەرهەنگی، پەروەردەیی و... بەمەبەستی گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی خاوێن و بێ تووشبوون و قاچاغی ماددە هۆشبەرەکان.

## ڕێگا چارەکان

1- پێویستە تەواوی دەزگا و نیدارەکانی شوێنەواردانەر لەسەر ماددە هۆشبەرەکان سەرەڕای ئەندامانی ئێستا بێن بە ئەندام لە ناوەند.
2- ڕێکخستنی تەشکیلاتی (تەنزیمات) ناوەند و چالاککردنی هەرچی زۆرتری ئەندامانی ناوەند لە چوارچێوەی کاروباری بە ڕێوەبەری و بەرنامەڕێژی.

## ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان

بە پێی ماددەی 33 ی یاسای خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان، ناوەند بە سەرۆکایەتی سەرۆك کۆمار بەرزترین ناوەندی بەڕێوەبەری و بڕیاردان بە مەبەستی پشتگیری لە تووشبوون و خەبات لەگەڵ قاچاغی ماددە هۆشبەرەکان لە هەموو جۆرەکانی بەڕێوە دەچێ.

### ئەندامانی ناوەند (ستاد)

1- سەرۆك كۆمار- سەرۆکی ناوەند
2- دادگەری گشتی وڵات

3- وەزیری وڵات

4- وەزیری ئیتلاعات

5- وەزیری تەندروستی، دەرمان و ئامووزشی پزیشکی

6- وەزیری ئامووزش و پەروەردە کردن

7- سەرۆکی ڕێکخراوی دەنگ و ڕەنگ (تەلەفزیۆن)

8- بەرپرسی هێزە ئیزامییەکان (نیروی انتظامی)

9- سەرۆکی دادگای شۆڕشی ئیسلامی تاران

10- سەروکی ڕێکخراوی بەندیخانەکان و پەروەردە

11- فەرماندەی هێزەکانی بەرگری

12- وەزیری رۆشنبیری و ڕێنوێنی ئیسلامی

## تێبینی ماددەی 33

سەرۆك کۆمار دەتوانێ بۆ ئیدارەکردنی کۆبوونەوەکانی ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان نوێنەرێك لەلایەن خۆی دابنێ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەرکەکانی ناوەند و چوارچێوەی بەرفراوانی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان لە کۆمەڵ و پێویستی هاوکاری و بەشداری دەستگاکانی کاروباری نێودەوڵەتی و لاوان، پێشنیاری هەیە رادەی ئەندامانی خۆی زۆرتر بکات و ئەوانەی خوارەوەی پێ زیاد بکات.

1- وەزیری دەرەوە

2- شورای بەرزی لاوان

3- سەرۆکی ڕێکخراوی پڕوپاگەندەی ئیسلامی

4- سەرۆکی گومرکی وڵات

5- سەرۆکی ڕێکخراوی پەروەردەکردنی لەش

## ئەرکەکانی ناوەند

سیاسەت، بەرنامەرێژی، هاوئاهەنگی، چاودێری و... لە زۆربەی روانگەکان وەك:
- بەربەرەکانی لەگەڵ هاتنە ژووری ماددە هۆشبەرەکان بۆ وڵات.
- بەربەرەکانێ لەگەڵ دابەشکردن.
- کاروباری فەرهەنگی، پروپاگەندە، ئامووزشی گشتی و کەمکردنەوەی داواکاری.
- کاروباری مافەکان و نێودەوڵەتی.

## لە رێگای

1- پەسەندی پەیرەو و پرۆگرامەکان و دارشتنی بریارەکانی بەرێوەبەری پێویست و پەسەندی گەلاڵەی پێشنیار کراو لە لایەن دەستگا بەرێوەبەری و قەزاییەکان.
2- دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی بەرێوەبەری و قەزایی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان لە چوارچێوەی نێوخۆ، ناوچە و نێودەوڵەتی.
3- دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی فەرهەنگی، پروپاگەندە و ئامووزشی بە بەمەبەستی وریاکردنەوەی هەمەلایەنەی کۆمەڵگا لە پشتگیری لە پێش هاتنی تاوانەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان.
4- دەنگدانەوەی چالاکییەکان و بریارەکانی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی و راکێشانی یارمەتییەکانی خەڵك و نێو دەوڵەتی.
5- دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی مەتاڵاکردن و لێکۆڵینەوە لە چوارچێوەی جۆراوجۆری خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان.
6- پێکهێنانی هاوئاهەنگی لە نێوان دەستگاکانی بە رێوەبەری و قەزایی و لابردنی کۆسپەکانی سەر رێگا.
7- چاودێری بەسەر قازانجەکانی بەرێوەبەری یاسا و دانی رای ئیسلامی بە مەبەستی پیاچوونەوە یا پەسەندی یاساکانی پێویست.
8- هەڵسەنگاندنی چالاکی دەستگاکانی پەیوەندیدار لە کاروباری خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان.

9- دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی پێویست بۆ هاندانی بەشی خسووسی و پیشەیی بەمەبەستی پێکهێنانی ناوەندەکانی ئامووزشی پیشە، بەڕێوەبردنی خزمەتەکانی راوێژکاری و پشتیوانی ئامووزشی گشتی، دامەزراندنی ئەنجومەنەکانی خێرخوازی، کلینیکەکانی دەرمانی و وازهێنان و پەروەردە کردن بۆ پشتگیری لە تووشبوون.

10- پەسەندکردنی بەرنامە و دیاریکردنی بوودجەی ساڵانە و پێشکەشکردنی بە دەستەی و چاودێری بەسەر خەرجیەکان.

11- بەڕێوەبردنی نووسینگەکان و بڕیارەکانی پێویست لە کاروباری خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان.

## تێبینی

کۆبوونەوەکانی ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان، هەر پازدە رۆژ جارێک بە بەشداری تەواوی ئەندامان بەڕێوە دەچن و هەر چەشنە ئاڵوگۆڕ لەکاتی کۆبوونەوەکان دێتەوە سەر بڕیاری ناوەند.

ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان تەنیا رێکخراوێکە لە ئێراندا بۆ پشتگیری و بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان پێك هاتووە. ئەم رێکخراوە، وەکو نووسراوە و ئامانجەکانی کە ئاماژەی پێکراوە بەڕێوە ناچن و بە پێچەوانەی سیاسەتەکانی، راستەوخۆ لە خزمەت بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێرانە، ئەو کەسانەی ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی لە کوردستاندا، بڵاو دەکەنەوە پەیوەندییان بەم رێکخراوەوە هەیە. باشترین و زیندووترین بەڵگە لەم بوارەدا خەڵکی کوردستانن.

# بەشی سێهەم: بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا

## هەڵکەوتوویی جوگرافیایی ڕۆژهەڵاتی کوردستان

ڕۆژهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێران) لە ڕۆژئاوای وڵاتی ئێران هەڵکەوتووە و پێکهاتووە لە پێنج پارێزگا ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کوردستان، کرماشان، ئیلام و لورستان. بە پێی هەندێك سەرچاوە ڕووبەری کوردستانی ڕۆژهەڵات، 124 هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشەیە[59]. حەشیمەتی ئەم بەشەی کوردستان 13% ی حەشیمەتی ئێرانی پێك هێناوە و زیاتر لە 10 میلیۆن کەسە[60]. سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ کوردستانی باکوور (تورکیە) و کوردستانی باشوور (عێراق) لە باشوورەوە لەگەڵ پارێزگاکانی خوزستان و کە هکیلویە و بۆیر ئەحمەد، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ پارێزگاکانی هەمەدان و قەزوین و ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات (تەوریز) لە باکوریشەوە لەگەڵ وڵاتی ئەرمەنیستان هاوسنوورە.

نزیکەی 1 میلیۆن کورد لە شاری تاران دەژین و هەروەها زیاتر لە 300 هەزار کوردیش لە مەڵبەندی قووچان لە پارێزگای خوراسان لە ڕۆژهەڵاتی ئێراندا، دەژین. ئەم کوردانە لە سەردەمی پاشایەتی سەفەوییەکان لە ماڵی و سامانی خۆیان لە کوردستاندا، دەرکراون و گواستراونەتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران.

## ڕادەی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

مادده هۆشبەرەکان، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە ڕێژەیەکی زۆرتر بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی ئێراندا، بڵاوبووەتەوە. پێشتر ئاماژە بەوەی کرا نزیکەی 10٪ی ئێران بە مادده هۆشبەرەکان تووشبوون. ئەم ڕێژە لە کوردستاندا،

زۆرترەو هەرچەندە لەو پەیوەندییەدا ئامارێکی دروست لەبەردەست دا نییە، بەڵام راستییەکان ئەوەی دەردەخەن لە نێوان 15 تا 20٪ی خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵات گیرۆدەی ئەم ماددە ماڵوێرانکەرە بووبن.

لە سەرتاسەری کوردستان ماددە هۆشبەرەکان لە هەموو جۆرەکانی زۆر بە ئاسانی و بە ئاشکرا دەست دەکەوێ و تەنانەت نرخیشی بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی ئێران زۆر هەرزانترە و بەشێك لە قاچاغچی یان بە مەبەستی بازرگانی کردن ماددە هۆشبەرەکان روو دەکەنە کوردستان و ئەو ماددەیە دەکڕن و لە شارەکانی دیکەی ئێران بە نرخێکی گرانتر دەیفرۆشن. لە پەیوەندی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستاندا، محەمەد رەئوف پەیامنێری گۆڤاری ((لڤین)) لە بۆکان دەڵێ: کاتێك بە پارکی سەرەکی شاری بۆکاندا تێپەڕ دەبێ چەندین گەنج دەبینی کە لەژێر دارەکاندا کەوتوون و بێناگان و باری دەروونیان شێواوە. ئەم دیاردەیە بە رێژەیەکی زۆر لە نێو گەنجانی شاری بۆکاندا بەربڵاوە، لەو بارەوە رەحیمی مورادی خاوەن بڕوانامەی ماستەر لە بواری دەروونناسی رۆژانە لەگەڵ گەنجانی ئالوودە بوودا کاردەکات، ئەو سەبارەت بە ژمارەی ئالوودە بووان و ئەو کارانەی کراون بۆ رێگری لەم دیاردەیە وتی: ئەو رێژەیەی کە بە رەسمی دەوڵەت بڵاویکردووەتەوە سەبارەت بە ئالوودە بووان بە تلیاك (تریاك) لە سەرانسەری ئێراندا، 3 میلیۆن کەسە. بەڵام پێدەچێت دەوڵەت نەیەوێت بە دیقەت ژمارەکە بڵێت. سەبارەت بە دەرکەوتنی دیاردەکەش موڕادی وتی: لە زۆر شوێن دا لە ژێر پرد و گۆشە و حاشییەکانی شار و پارکەکاندا، لە زۆربەی ئەو شوێنانەدا، ئاسەواری بەکارهێنانی تریاك لای گەنجان دەبینی و لە زۆر شوێندا بە چاوی خۆت فرۆشتنی ئەم مەوادە دەبینی[61].

کوچەو کۆڵانەکان، قوتابخانە، ناوەندەکانی ئامووزشی، پارکەکان، سەیرانگەکان، تەنانەت دێهاتەکان بە رێژەیەکی زۆر بەرچاو ماددەی هۆشبەر هەیە، ئەو کەسانەی بازرگانی پێ دەکەن هەموویان لە نێو خەڵکی ناسراون و بە بێ هیچ کۆسپێك لەسەر رێگاندا ئەو ماددەیە بڵاو دەکەنەوە.

هەندێك لە ئۆرگانەكانی رژێم، لە بلاوكردنەوەی ماددە هۆشبەرەكان نەخشێكی بەرچاویان هەیە. لەو پەیوەندییەدا (ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەكان - ستاد مبارزه با مواد مخدر) لە كوردستاندا، بە جێی ئەوەی ئەركی خۆی واتە كۆنترۆڵ و پشتگیری لە بلاوبوونەوەی و بەكارهێنانی ئەم ماددەیە بگرێ، راستەوخۆ پەیوەندی بە بلاوبوونەوەی ئەم ماددەیە هەیە و لە رێگای كەسانی ناسراو و رێنوێنی كراو بە شاهیدی خەلكی كوردستان و تووشبووان پەرە بە بەكارهێنان و بلاوكردنەوەی ئەم ماددەیە دەدا و زۆربەی ئەو كەسانەی ماددە هۆشبەرەكان بلاودەكەنەوە پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ ئەو ئیدارەیە هەیە.

((عبدالعزیز مەولودی)) مامۆستای زانكۆ و هەلگری بڕوانامەی ماستەر لە زانستی سیاسی و سەرۆكی (دامەزراوەی عیرفان بۆ رێگری لە تووشبوون) چەند ساڵێكە لەو بوارەدا كاردەكات، ناوبراو دیاردەكە بە قەیرانێكی گەورە لە شارەكەیان (بۆكان) وەسفكرد و بەشێكی هۆكارەكەشی بۆ بەربلاوی و ئاسان دەست كەوتنی ئەو ماددەیە گەڕاندەوە[62]. لە لایەكی دیكەوە مورادی بۆ پەیامنێری لڤین دەڵێ: رێژەی بەكارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەكان زیاتر لەناو توێژی گەنجان دایە، بەڵام ئەو بەداخ بوو كە ئێستا دیاردەكە لە نێوان ژنان و منداڵانیشدا بەدی دەكرێت[63]. لە درێژەی لێدوانەكەی دا مورادی دەڵێ: بەداخەوە یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی تووشبووان ئەوەیە كە هەوڵدەدەن كەسانی هاوتای خۆیان زیاد بكەن، بۆ ئەوەی كەمتر رێگیریان لی بكرێت و بتوانن بە ئاسانیی دەستی بخەن و بەكاری بێنن[64].

ئەو راپۆرتەی گۆڤاری لڤین لە شاری بۆكان و چۆنیەتی بلاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەكان لەو شارەدا وێنەی شارەكانی دیكەی كوردستانە و بە شێوەیەكی زۆر مەترسیدار لە كوردستاندا بلاو بووەتەوە و هەرەشە لە داهاتووی ئەم بەشەی كوردستان دەكات و خەلكی لەو بوارەوە هەراسان كردووە و ژیانی ئالۆز كردوون. هەر خێزانێكی رۆژهەلاتی لانی كەم تووشبووێكی ماددە هۆشبەری تێدایە و زۆر خێزانیش هەن كە تەواوی ئەندامانی بنەماڵەكە تووشبوون.

بەپێی دوایین سەرچاوەکان و وتەی تووشبووان نرخی هیرۆیین لە کوردستاندا، لە تریاك هەرزانترە، ئەوە لە کاتێکدایە لە هەر 100 کیلۆ تریاك تەنیا 1 کیلۆ هیرۆئین دروست دەکرێ. بەلاّم بۆ ئەوەی گەنجان و خەڵکی کوردستان بە شێوەیەکی خێراتر بەرەو تووشبوون بوون و بتوانن بە ئاسانی دەستیان بکەوێ هەرزانیان کردووە.

## هۆیەکانی ئالوودەبوون و سیاسەتەکانی رژێم لەو پەیوەندییەدا

تەواوی ئەو هۆکارانەی بۆ تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان لەئێراندا باسکران، کوردستانیش دەگەرێتەوە لە هەندێك بواردا. ئەو هۆکارانە شوێنەواریان زۆرترە. لەکوردستان دا گرفتی نەبوونی ئیش و کار و هەروەها خوێندن لە ئاستی زانکۆدا، زۆر زەق و بەرچاوەو بەشیکی زۆر لە لاوان بۆ وەدەست هێنانی ئیش و کار روو لە شارەکانی دیکەی ئێران دەکەن و لەو رێگایەوە لەوانەیە تێکەڵی ماددە هۆشبەرەکان بن. لە لایەکی تریشەوە، ئەو لاوانەی بۆ درێژە بەخوێندن روو لە شارەکانی دیکەی ئێران دەکەن ئەوانیش بەشێکی زۆریان تێکەڵی ماددەی هۆشبەرەکان دەبن. گرفتەکانی گرانی و بێکاری لە کوردستاندا، بە بەراوورد لەگەڵ شارو ناوچەکانی دیکەی ئێران زۆرترە، هەر بۆیە شوێنەواری خراپی ئەم گرفتانە لەچاو شوێنەکانی دیەی ئێراندا زۆرتر بەرچاوترە.

لە هەمووی گرینگتر، سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامییە. ئەم رژێمە بە پێی سیاسەتەکانی خۆی هەر لە یەکەم رۆژەکانی هاتنە سەرکاریدا، بە شێوەیەکی دارێژراو ماددە هۆشبەرەکانی لە کوردستان دا بڵاوکردووەتەوە. سیاسەتی کۆماری ئیسلامی گیرۆدەکردنی خەڵکی کوردستان بە تایبەتی لاوانی رۆژهەلاّت بە ماددە هۆشبەرەکانە تا لەو رێگایەوە هێزی کوردستان کە لە لاوان سەرچاوە دەگرێ لاواز بکات و بتوانی بە بێ گرفت سیاسەتەکانی لەم بەشەی کوردستاندا، بەرێوەبەرێ. هەر وەك ئاماژەی پێکرا، تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکان کەسانی ترسنۆك، بێ غیرەت، بێ ئیرادە و لاواز باردێن کە بۆ وەدەست هێنانی

مادده هۆشبەرەکان ئامادەن هەموو چەشنە کارێك لە خۆفرۆشییەوە تا دزی و... بکەن. تەنانەت بەشێکیان تێکەڵ بە سیاستەکانی رژێم لـە کوردسـتاندا دەبـن و لاوانی کوردستان تێکەڵ بە مادده هۆشبەرەکان دەکەن و بەرێوەبەری کردەوەکانی رژێم دەبن. بەم شێوەیە کۆماری ئیسلامی لەباتی ئەنفال، قەلاچۆکردن، کیمیـایی باران و... هتد لە ریگای مادده هۆشـبەرەکان دا، جینۆسـایدێکی بێـدەنگ بـە رێوەدەبات. ئەم سیاستە ناکامی زۆر مەترسـیدارترە لـە ئەنفالـەکانی باشـووری کوردستان و رۆژبەرۆژ وەکـو نەخۆشـییەکی مەترسـیدار لـە پەرەسـەندن دایـە و ئەوانەی گرفتاری ئەم نەخۆشییە (تووشبوون) دەبن بە بێ ئەوەی خۆیان هەست پێ بکەن بەرێوەبەری سیاستەکانی رژێم لە کوردستان دادەبن. بەداخـەوە ئـەو هێـزو گڕوتینەی لاوان بە جێ ئەوەی بۆ رزگاری گەلەکـەی و وەدەسـت هێنـانی مـافی چارەنووس دژی دەسەلاتی حاکم بەسەر ولاتەکەی خەبات بکات، تووشـی مـادده هۆشبەرەکان دەبێت و ئەوەی بە لایـەوە گـرینگ نـەبێت هەسـتی نەتەوایـەتی و ئازادی گەلەکەیەتی. رژێمی کۆمار ئیسـلامی بـۆ بـەرێوەبردنی ئـەم سیاسـەتەی خۆی لە هەموو کەرەستەیەکی پێویست کەڵك وەردەگرێ و تەنانەت ئەو ئورگان و رێکخراوانەی بۆ کۆنترۆلکردنی مادده هۆشبەرەکان دامەزراون بە پێچەوانە، پەرە بە بلاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکان دەدەن، یەکێك لەو رێکخراوانـە، هـەر وەك پێشتر ئاماژەی پێ کراوە، ((ستاد مبارزە با مواد مخدر)) (ناوەنـدی خـەبات دژی مادده هۆشبەرەکان) لە کوردستان دایە. تەواوی ئەو کەسانەی لەکوردسـتاندا بـە شێوەی ئاشـکرا و لەبەرچـاوی خـەڵکی مـادده هۆشـبەرەکان بـلاو دەکەنـەوە و بازرگانی پێدەکەن پەیوەندی یـان بـەم ناوەنـدەوە هەیـەو بەشـێکی زۆری مـادده هۆشبەرەکەیان ئەو ناوەندە بۆیـان دابـین دەکـات. ناوەنـدی خـەبات دژی مـادده هۆشبەرەکان، ئە مەوادده‌ی لە شارەکانی دیکەی ئێراندا دەستی بەسەردا دەگرێت دێنێتە کوردسـتان و لـە رێگـای کەسـان و عـەواملینی تایبـەتی خـۆی لـە نێـو کۆمەڵگای کوردستان بلاوی دەکاتەوە. لـەو پەیوەندییـەدا ئیتلاعـاتی رژێـم لـە کوردستاندا دەستێکی بالای هەیە و بە هاوکـاری ناوەنـدی خـەبات دژی مـادده هۆشبەرەکان. ئەم ماددەیە دێنێتە کوردستان و لە نێـو لاوان دا، بلاویدەکاتـەوە.

کاتی لێکۆڵینەوە لە تووشبووان لە ساڵی 1999، لاوێکی سنەیی بە ناوی سمایل چراغی وتی تەمەنم 16 ساڵ بوو، لەگەڵ کوڕێکی هاوتەمەنم بە شەڕ هاتم و لە لایەن هێزە نیزامییەکانی رژێم (نیروی انتظامی) گیران و رەوانەی بەندیخانە بەشی لاوان کراین، لە ماوەی ئەو شەش مانگە کە لە بەندیخانە بووم. ماددەی هۆشبەریان پێ ناساندم تەنانەت دەستمکرد بە بەکارهێنانی دوای تەواوبوونی ماوەی بەندی بوونم بە لاوێکی تووشبوو درامەوە بنەماڵەکەم، ناوبراو لە درێژەی قسەکانی دەڵێ: لە بەندیخانەدا ماددەی هۆشبەر بە شێوەیەکی زۆر بەر بڵاو لە لایەن بەرپرسانی بەندیخانە بە بەندییەکان دەفرۆشێت بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی لە نێو بەندیخانە بەکاری دێنن[65].

سیاسەتەکان کۆماری ئیسلامی سەبارەت بە پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان سنووری وڵاتی ئێرانی بڕیوە و روویکردووەتە کوردتانی باشوور و بەشێکی زۆر لە لاوانی ئەم بەشەی کوردستان گیرۆدەی ئەم ماددە ماڵوێرانکەرە کردووە. بەداخەوە رژێم (بە تایبەتی ئیتلاعات) لە ڕێگای کەسانی تایبەتی خۆی ماددە هۆشبەرەکان رەوانی کوردستانی باشوور دەکات و بە هاوکاری هەندێك کوردی هەلپەرست کە دەیانەوێ بە ماندووبوونێکی زۆر کەم پارەیەکی زۆر وەدەست بێنن ئەم ماددەیە بڵاو دەکەنەوە. ئێستا ماددە هۆشبەرەکان لە زۆربەی شارەکانی کوردستانی باشوور بەتایبەتی سلێمانی، هەڵەبجە، پێنجوین، سەیدسادق، خورماڵ، دەربەندیخان و تەنانەت هەولێریش دەست دەکەوێ و لە روخساری لاوان ئاسەواری بەکارهێنانی ئەم ماددەیە زەق و بەرچاوە. هەرچەند رۆژ نییە هێزەکانی ئاسایش دەست بەسەر ئەم ماددەیەدا نەگرن کە بە هۆی قاچاخچیان و عەواملینی کۆماری ئیسلامییەوە ئەم دیوکراوە بەو حاڵەش ماددە هۆشبەرەکان رۆژبەرۆژ لەپەرەسەندن دایە و ئەگەر ڕێگاچارەیەکی گونجاوی بۆ نەدۆزرێتەوە لە داهاتوودا، دەبێتە گرفتێکی گەورە وەکو کوردستانی ئێرانی لێ دێت و ئەو کات چارەسەرکردنی زۆر سفشار و دژوار دەبێت. عەقید جەلال ئەمین بەگ لێپرسراوی بەشی ماددە هۆشبەرەکان لە ئاسایشی سلێمانی دەڵێت: لە

ماوەی یەك ساڵدا، 105 کەسمان بەتومەتی بەکارهێنان و بازرگانی کردن بەماددە هۆشبەرەکان دەستگیرکردووە. 30 کەس لەو دەستگیرکراوانە دادگای کراون و ژمارەیەکی تریشیان چاوەڕێی دادگایی کردن دەکەن و ژمارەیەکیش تومەتەکانیان ساغ نەبووەتەوە و ئازاد کراو. ناوبراو وتی: ئەوانەی بەو تۆمەتە دەستگیرکراون عیراقی (کورد و عەرەب) و ئێرانین، دیارە زۆربەی دەستگیرکراوەکان ئێرانین'[66]'.

عەقید جەلال لەو چاوپێکەوتنەدا، وتی لەماوەی ساڵێکدا توانیومانە دەست بگرین بەسەر 24 کیلۆ تلیاك و حەشیش و هیرۆیینەوە'[67]'. هەر لەم پیوەندی یەدا، سامان حەمەکەریمی رۆژنامەنووس لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ پێی وایە وڵاتی ئێران هۆی سەرەکی بڵاوبوونەوەی دیاردەکەیە ئێستا لە کوردستاندا، دەیان کۆمپانیای ئێرانی کاردەکەن و رۆژانە هاتوچۆدەکەن و هەروەها خەڵکی ناوچەی سەرسنوورەکان هۆکارێکی کە رۆژانە هاتووچۆ و سەردانی ئێران دەکەن و هەندێك لەو کەسانە ئەو ماددانە دەهێنن'[68]'.

## پەیوەندی بزووتەوە کوردییەکانی کوردستان بە ماددە هۆشبەرەکان

مێژووی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەگەرێتەوە بۆ سەدەی نۆزدە و دواتریش جوڵانەوە سمایل ئاغای شکاك (سمکۆ)، دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و دامەزرانی کۆماری کوردستان لەلایەن ئەم حیزبەوە. بەڵام پەیوەندی بزووتنەوە کوردییەکان یا سیاسەتی حیزب و رێکخراوە کوردییەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان بە ماددە هۆشبەرەکان، دەگەرێتەوە بۆ شۆرشی 1979ی زایینی و هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی. لەبەرئەوەی لەو دەمەوە بەم لاوە ماددە هۆشبەرەکان لە ئیران و رۆژهەلاتی کوردستاندا وەك چەکێکی سیاسی و دژی گەلی بەکارهاتووە وە ئەم رژێمە بە پەرەپێدانی ماددە هۆشبەرەکان رێگای بۆ بەرێوەبردنی سیاسەتەکانی خۆی خۆش کردووە.

هەر لە یەکەم ساڵەکانی حکوومەتی خۆی (کۆماری ئیسلامی) دژی داخوازەکانی گەلی کورد هەنگاوی هەڵگرتووە و هیچ چەشنە مافێکی بەم گەلە چەوساوە بە

ڕەوا نەدیوە و دژی گەلی کورد ئیعلامی شەڕی کرد[69] وە ئەو شەڕەش تائێستاش هەر بەردەوامە (لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی ڕەسمی ئەو شەڕە ڕانەگیراوە و کۆماری ئیسلامی ئامادە نییە هیچ چەشنە مافی گەلی کورد بدات). لە بەرامبەر ئەم سیاسەتەی کۆماری ئیسلامیدا بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلە کورد دژی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی و بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد خەباتی کردووە.

بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بەرێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەڕێوە چووە. ئەم حیزبە 61 ساڵ مێژووی خەباتی هەیە و لەو دەمەوە تائێستاش دژی سیاسەتەکانی حکومەتەکانی پاشایەتی و ئیسلامی هەڵوێستی گرتووە. لە دوایین هەڵبژاردنەکانی کوردستاندا (ڕۆژهەڵات) کە ساڵی 1980 بەڕێوەچوو، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سەدی80٪ی دەنگەکانی وەدەست هێناو[70] ئێستاش ئەم حیزبە لە نێو خوڵکی ڕۆژهەڵات، حیزبی خۆشەویستە. سیاستەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە بەرامبەر کردەوەکانی ڕژێم لە پەیوەندی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دژی هەنگاوی هەلگرتووە وە زۆر بە توندی هەڵوێستی نیشان داوە. ئەم حیزبە لە تەواوی دەزگا ڕاگەینە گشتییەکانی خۆی (تیشك tv، کوردستان، ڕادیۆ دەنگی کوردستان و... ) دژی بازرگانی کردن بە ماددە هۆشبەرەکان، بڵاوکردنەوەو بەکارهێنانی و سیاسەتە چەپەڵەکانی ڕژێم لەو پەیوەندییەدا، خەڵکی ئاگادارکردوتەوە و هاوکات ئەو کەسانەی لەو پەیوەندییەدا، هاوکاری ڕژێمیان کردووە و بە شێوەیەك ماددە هۆشبەریان بڵاو کردوەتەوە سەبارەت بەو کارە دژی گەلییە ئاگادار کراونەتەوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لەبەر ئەوەی لە نێو یاساکانی ڕژێمی کۆماری ئیسلامیدا، نایاسایی‌و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری نییە لە پیوەندی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان و سیاسەتەکانی ڕژێم تەنیا لەتوانایدا ڕێنوێنی لاوان و خەڵکی کوردستان بکات و لە مەترسییەکانی ئەم ماددەیە ئاگاداریان بکاتەوەو ئەوانەی بە

شێوەیەك بەڕێوەبەری سیاسەتی ڕژێمن لەو کارە نا مرۆڤانەیە و دژی گەلییە ئاگادار بکاتەوەو ئەگەریش پیویست بێت لەکاتی خۆی هەڕەشەیان لیّ بکات.

ئەم حیزبە تەنانەت لە نێو ریزەکانی خۆیدا، بڕیاری دیاریکراو و روونی بە نیسبەت مادده هۆشبەرەکان هەیە. بۆ وێنە ئەو کەسانەی بە مادده هۆشبەرەکان تووشبوون یا بازرگانی یان پیّ دەکەن وەك پێشمەرگە یا ئەندام وەرناگرین[71].
تەنانەت لە نێو خۆی حیزبیشدا هیچ کەس بۆی نییە پروپاگەندە بۆ بەکارهێنانی ئەم مادده مالۆێرانکەرە بکات و ئەم حیزبە مادده هۆشبەرەکانی وەك یەکێك لە چەکەکانی کۆماری ئیسلامی دژی گەلی کورد دەزانێ و ڕ پووچەلّ کردەوەی سیاسەتەکانی لە هەلّ و کۆششی بەردەوام دایە.

حیزب و ڕێکخراوەکانی دیکەی سەربە ڕۆژهەلاّتی کوردستان وەك: کومەلّە کەئێستا بووە دوو ڕێکخراو (کۆمەلّەی زەحمەتکێشانی کوردستان ئێران و شاخەی کوردستانی حیزبی کومۆنیستی ئێران-کۆمەلّە).

ئەم دوو ڕێکخراوەش دژی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی لە پەیوەندی لەگەلّ مادده هۆشبەرەکان لە دەزگا ڕاگەینە گشتییەکانی خۆیاندا، خولکی کوردستانیان ئاگادار کردووەتەوە و دژی بەکارهێنان و بازرگانی بەو مەوادەدەن.
چەند حیزب و ڕێکخراوی بچووکی دیکەی کوردستان کە چالاکی سیاسی یان هەیە. ئەوانیش دژی مادده هۆشبەرەکان و سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامین.

کەوابوو، کۆماری ئیسلامی لە مادده هۆشبەرەکان وەك چەکێکی دژی گەلی کەلّکی لیّ وەرگرتووە و روون و ئاشکرایە، بزووتنەوەی کوردیش لە ڕۆژهەلاّتی کوردستاندا، دژی ئەم سیاسەتە دژی گەلە ڕاوەستێ و گەلی کورد لەو پەیوەندییە دا ئاگادار بکاتەوە.

## بەکورتی

لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، بەکورتی ئاماژە بەگرفتی ماددە هۆشبەرەکان لـە هـەموو بوارەکـانی دەکـەین. لای زۆر کـەس مـاددە هۆشـبەرەکان تـەنیا وەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی و تووشبووانیش وەك تاوانبار سـەیر دەکـرێن، ئـەوە لـە کاتێکدایە، ئەم مەسەلەیە زۆر لەوە قووڵترە و کێشەکە زۆر لەوە گـەورەترە هـەر بۆیە بە کورتی ئاماژەی پێ دەکەین:

1- **کێـشەی تەندروسـتی:** بـەکارهێنانی مـاددە هۆشـبەرەکان (لـە هـەموو جۆرەکانی) سەرەتا شوێنەوار لەسەر لەش دانانـێ، بـەڵام لـە درێژخایـەن داو بەدوای راهاتن لە بەکارهێنانی شـوێنەواری لەسـەر لـەش و فـامی (دەروون) مرۆڤ دەردەکەوێ و ئەم شوێنەوارەیە هەم لە بواری تەندروستییەوە مرۆڤ لاواز و هەم لەبواری دەروونییەوە بێهەست، بێغیرەت، ترسنۆك، بێعاتیفە باردێنێ و لەبەر ئەوەی نەخۆش (تووشبوو) لە بواری کۆمەڵایەتییـەوە پێگـەی نامێنـێ لەبەر چاوی خەڵکی سووك و بێقیمەت دەبێ هەربۆیە بە هەڵە وەکو تاوانبـار سەیر دەکرێت. ئەگەر وەکو نەخۆشی سـەیری تووشـبوون بکـەین، لەبـەراورد لەگـەل نەخۆشـییەکانی دیکـەی ئـەم سـەردەمە وەك، شـێرپەنجە و ئەیـدز، تووشبوون بە ماددە هۆشـبەرەکان زۆر مەترسـیدارترە و قوربانییـانی لەگـەڵ قوربانی شێرپەنجەو ئەیدز بەراورد ناکرێ. بە پێی دوایین سەرچاوە کـە پێـشتر ئاماژەی پێکرا لە سەرتاسەری جیهاندا، 200 میلیۆن تووشبوو (نەخۆش) بـە ماددە هۆشبەرەکان لە زیاتر لـە 170 وڵاتـی جیهانـدا بەچـاو دەکـەوێ ئـەم ڕێژەیە ڕۆژ بەرۆژ لە پەرەسەندن دایە.

2- **کێشەی کۆمەڵایەتی:** پێگەی کۆمەڵایەتی تووشبووان لە نێـو کۆمـەڵگادا، زۆر لاوازە و خەڵکی وەکو تاوانبار سەیری تووشبووان دەکـەن. تەنانـەت بـە پێی یاسـای وڵاتەکەیان زۆربەیان ئیش و کاریان لەدەست دەدەن و لە زۆربـەی مافەکانی مرۆڤ بێبەش دەکرێن و لە بواری پێڕاگەیشتنی تەندروسـتییەوە لـە پەراوێز دەخرێن. تەنانەت لە نێو بنەماڵەکانیشدا ئـەو کەسـەی ئەنـدامێکی

بنەماڵەکەی ماددە هۆشبەرەکان بەکاردێنێ هەست بە سەرشۆڕی دەکات و تەنانەت زۆرجاران هەڕەشەی کوشتنیان لێ دەکەن.

تووشبوو بە ماددە هۆشبەرەکان بە پێچەوانەی نەخۆشییەکانی دیکە لە نێو کۆمەڵگادا، بەهانایەوە ناچن و تووشبووان لە خۆیان دوورتر دەکەنەوە، ئەم مەسەلەیە زۆرتر تووشبوو بەرەو داوی تووشبوون و لەبەین چوون دەبات.

3- **کێشەی ئابووری:** بازرگانی کردن بە ماددە هۆشبەرەکان یەکێك لە سوودهێنەرترین پیشەکانی سەردەمەو هەر ئەوەش کاری کردووەتە سەر ئەم مەسەلەیە و رۆژبەرۆژ لە پەرەسەندن دایە و ئەوانەی تووشی ئەم گرفتە دەبن (تووشبوون) بە بەردەوامی پارەی خۆیان سەرفی وەدەست هێنانی ماددەی هۆشبەر دەکەن و ئەم مەسەلەیە بەردەوام دەبێت تا پارەیان پێنامێنێ. لێرەدایە بۆ وەدەست هێنانی پارەی پێویست، روو دەکەنە زۆر کاری ناشایست، وەك فرۆشتنی کەرەستەی نێوماڵ، دزی، خۆفرۆشی و... هتد. ئەم مەسەلەیە کێشەو گرفتی دیکە لە نێو کۆمەڵگادا دروست دەکا و ئەوانەی تووشبوون بنەماڵەکانیان تووشی قەیرانی ماددی دەکەن و زۆرجاریش ئەم گرفتە شوێنەوار لەسەر چۆنیەتی پەروەردەکردنی ئەندامانی بنەماڵە بەتایبەتی منداڵان دادەنێ.

4- **گرفتی سیاسی:** لە وڵاتانی دواکەوتوو، بەتایبەتی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، تووشبوون و تووشبوو بوونەتە یەکێك لە کەرەستەکانی سیاسی بۆ پەرەپێدانی سیاسەتی دژی گەلی و توندوتیژی بۆ سەرکوتکردنی خەڵکی لەلایەن دەوڵەتانەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بەشێك لە رێکخراوە توندڕەوەکانیش لە ماددە هۆشبەرەکان وەك پشتیوانی ماددی کەڵکیان لێ وەرگرتووە. ئەلقاعیدە، تالیبان، سوپای مەهدی و... هتد بە داهاتی ماددە هۆشبەرەکان کردەوە تیرۆریستییەکانی خۆیان لە سەرتاسەری جیهان بەڕێوە دەبەن. تەنانەت لە نێو رێکخراوەکانیشدا پەرە بە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان دەدەن تا ئەندامانیان لە کاتی کردەوە تیرۆریستییەکان بیر لە چارەنووسی کردەوەکانیان نەکەنەوە.

له لایەکی دیکەشەوە رژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران لـە رێگـای بڵاوکردنـەوەی مادده هۆشـبەرەکان تـێ دەکۆشـێ نەتـەوەی کـورد لـە رەگ و ریـشە دەربێنـێ (ژینوسایدی بێدەنگ) و گەلی کورد لە هەموو بوارێکـدا، بێهەسـت بکـا تـا بـە ئاسانی سیاسەتەکانی خۆی بەرێتە پێش.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


1- گۆڤاری سەردەم، ژمارە، 1، (1999).

2- هەمان سەرچاوە.

3- فرهنگ مواد مخدر، نوشته آلن کوهن.

4- هەمان سەرچاوە.

5- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟ د. ورنان کلمن.

6- فرهنگ مواد مخدّر.

7- هەمان سەرچاوە.

8- گۆڤاری سەردەم ژمارە 1، (1999).

9- جاده ابریشم، ایرین فرانك و دیوید براونستون.

10- حسن صباح و قلعة الموت، ناصر نجمی.

11- گۆڤاری سەردەم ژمارە 1، (1999).

12- هەمان سەرچاوە.

13- هەمان سەرچاوە.

14- مەوادی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا، مەهدی بەدری.

15- هەمان سەرچاوە.

16- هەمان سەرچاوە.

17- هەمان سەرچاوە.

18- هەمان سەرچاوە.

19- هەمان سەرچاوە.

20- هەمان سەرچاوە.

21- هەمان سەرچاوە.

22- ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

23- گۆڤاری سەردەم ژمارە 1، (1999).

24- هەمان سەرچاوە.

25- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟

26- هەمان سەرچاوە.

27- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟

28- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

29- هەمان سەرچاوە.

30- گۆڤاری سەردەم ژمارە 1، (1999).

31- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟

32- سایت مبارزه با مواد مخدّر.

33- اطلاعات سیاسی- اقتصادی شماره (163-164)

34- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا، اعتیاد چیست و معتاد کیست؟، لێکۆڵینەوە لە دەیان تووشبووی ماددە هۆشبەرەکان، دانستنیهای طب قدیم و جدید.

35- کوردستانە نوێ ژمارە 1979 (1999).

36- سایتی ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

37- اعتیاد چیست و معتاد کیست؟

38- هەمان سەرچاوە.

39- حقوق بشر و معتادان، دکتر منصور رحمدل.

40- فرهنگ مواد مخدر.

41- اطلس کامل گیتاشناسی، دوره دوم-چاپ (1379).

42- سیمای کشورهای جهان سوم، رضا بازرگانی.

43- ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

44- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

45- ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

46- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

47- هەمان سەرچاوە.

48- هەمان سەرچاوە.

49- هەمان سەرچاوە.

50- اصول مربوط به كاهش تقاضا، كنترل مواد مخدر سازمان ملل.

51- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

52- ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

53- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

54- اطلس كامل گیتاشناسی.

55- مەوادەی موخەددیر و بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا.

56- هەواڵەكانی شەبەكەی ای ئێران.

57- ستاد مبارزه با مواد مخدّر.

58- هەمان سەرچاوە.

59- هەمان سەرچاوە.

60- هەمان سەرچاوە.

61- گۆڤاری لڤین، ژمارە 46، (2006).

62- هەمان سەرچاوە.

63- هەمان سەرچاوە.

64- هەمان سەرچاوە

65- لێكۆڵینەوەی نووسەر لەسەر تووشبووان

66- رۆژنامەی ئاسۆ، ژمارە 232 (2006/6/4)

67- هەمان سەرچاوە

68- هەمان سەرچاوە

69- نیو سەدە تێکۆشان، عبدالله حسن زادە

70- هەمان سەرچاوە

71- ئایین نامەی پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەشی دووەم.